# جیهاد لەڕێی خوادا

چی یەو؟!

بۆچی دەکرێو؟!

چۆن دەکرێو؟!

چەند قسەیەکی دڵسۆزانە

بۆ

حوکمڕانەکانی کوردستان

چاپی یەکەم

عەلی باپیر

١٤٢٣ ٢٠٠٢

# جیهاد لەڕێی خوادا

## چی یەوە؟!

## بۆچی دەکرێ و؟!

## چۆن دەکرێ؟!

## و

## چەند قسەیەکی دڵسۆزانە

## بۆ

## حوکمڕانەکانی کوردستان

چاپی یەکەم

عەلی باپیر



١٤٢٢ك ٢٠٠٢ز

بسم الله الرحمن الرحيم

(يا أيها الذين آمنوا هل أدلكم على تجارة تنجيكم من عذاب أليم، تؤمنون بالله ورسوله وتجاهدون في سبيل الله بأموالكم وأنفسكم ذلكم خير لكم إن كنتم تعلمون)

(الصف: ١٠-١١).

# پێشكەش بێ

بەو مسـولمانە موجاهیدانـەی کـە تەنـها بەپاڵنـەری خـوا ڕازیكردنو وەك یـەكێك لـەعیبات گـەورەو گرنگـەكانی ئیسـلام بەجەنگو جیهاد هەڵدەستن، وە سەرەنجام لەبەرەكەتی ئەو نیازو مەبەستە پاكو بەرزەو هەست و نەستو هەڵوێستە شـەرعیی‌یە بەپێزەوە، لەهـەر جۆرە هەڵـەو پەڵـەو خلیسـكانێك دەپـارێزرێن كەمایەی گوناحباریی لای خواو عەیبداریی لای خەڵكی بێت.

# ئەم نامیلكەیە

خوێنەری بەڕێز!

ئەم نامیلكەیەی بەردەستت كە چوارەمین نامیلكەیە لەزنجیرەیەك كە دەربارەی (جیهادو جەنگ) نووسراون كە لەنامیلكەی: (جیهاد لەڕێی خوادا: بۆنەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین‌و لەسەر جەنگ كردنمان قەرزدار نەبینەوە)ش دا ئاماژەمان بەو مەسەلەیە كردوەو ناوی نامیكەكانیشمان هێناوە.

ئەم بەرهەمەش دەقی وتارێكە كەبەهەمان ناوونیشان لەمزگەوتی (جیهاد)دا لەسلێمانی دراوەو[1]، پاشان برای بەڕێزو دڵسۆزم كاك (مەلا بیلال قەڵادزەیی) لەكاسێتەوە هێناویەتە سەر قاقەزو ڕێكی خستوەو، خۆیشم چاوێكم پێدا خشاندۆتەوە، خوا پاداشتی كاك مەلا بیلال‌و سەرجەم ئەو براو خوشكە دڵسۆزانەمان بداتەوە كە بەهەر شێوەو ئەندازەیەك بووە خۆیان بەخزمەتی بەرهەمەكانی بەندەو پاراستن‌و تۆماركردن‌و بڵاوكرنەوەیانەوە ماندوو دەكەن‌و خۆیشم هەر هێندەم لەدەست دێ كە پاش دووعای خێر پڕ بەدڵ سوپاسیان بكەم‌و بێگومان ئەوانیش كەم‌و زۆر لەپاداشتی ئەو بەرهەمانەی بەندەدا بەشدار دەبن بەپێی فەرموودەی: (الدالُّ علـى الخير كفاعِلـه)[2] واتە: ڕێنمایی كار بەرەو خێرو چاكەیەك وەك ئەنجامدەرەكەی وایە.

خوای بەخشەریش ئەم بەرهەمەو هاوەڵەكانی دیكەی بكاتە مایەی زیاترو چاكتر بەرچاو روون كردنـەوەی مسوڵمانان بەگشتی‌و برا موجاهیدەكانمان بەتایبەت، لەبواری كارو جیهادی ئیسلامیی‌دا، كە بێگومان هەڵەو كرچ‌و

---

[1] ئەو وتارە لەرۆژی (٢ ی شعبان ١٤٢٢) بەرانبەر (١٩/١٠/٢٠٠١) دراوە.

[2] رواه العسكري وابن منيع والمنذري- عن ابن عباس رضي الله عنهما مرفوعاً، ورواه مسلم وأبوداود والترمذي وصححه عن ابي مسعود البدري بلفظ: (مَنْ دَلَّ خيرٍ فَلَهُ مِثْلُ أجْرِ فاعلِه)، بڕوانە (كشف الخفا ومزيل الالباس عما اشتهر من الاحاديث على السنة الناس)، ج١، ص٤٨٠، ٤٨١ للعجلوني.

کاڵییەکانی مسوڵمانان لەسەرجەم بوارەکانی کارو چالاکی ئیسلامییدا بەگشتیو بەتایبەت لەبواری جەنگو جیهاددا، هەم کەرەستەی پڕوپاگەندەو چەواشەکاریی باش دەخاتە بەردەست دوژمنو ناحەزەکانی ئیسلام بەخۆماڵییو دەرەکییەوە، هەم بیانوو و پاساو زیاتریشیان بۆ دەڕەخسێنێ بۆ دژایەتی ئیسلامو ئەهلی ئیسلام. بەناوو ناتۆرە لێهەڵدانی جۆراوجۆرەوە، کەبەداخەوە ژمارەیەکی زۆری خەڵکو جەماوەر بەبێ بیر لێکردنەوەو لێوردبوونەوە دەکەوێتە ژێر کاریگەرییانەوەو وەك تووتی قسەو بیروبۆچوونو ناوو ناتۆرەو پڕوپاگەندەکانی دوژمنانی ئیسلام دووپات دەکاتەوە!

٣ ذي‌الحجة ١٤٢٢

٢٠٠٢/٢/١٥

هەورامان – ئەحمەدئاوا

# ڕێ خۆشکردن

خوێنەری بەڕێز !

لەم نامیلکەیەدا سەرەتا لەسێ ڕووەوە لەبارەی جەنگ و جیهادەوە دراوین، بەم جۆرەی خوارێ:

یەکەم: پێناسەو پلەو پایەی جیهاد

کەویڕای پێناسەی (جیهاد) لەئەسڵی زمانی عەرەبیداو لەڕوانگەی شەرعیشەوە، لەبەر تیشکی چەند ئایەتێکیش دا باسی پلەو پایەی بەرزو ئاوازەی جیهادو پاداشتی بێ وێنەی جەنگاوەرو موجاهیدان کراوە.

دووەم: جیهاد بۆچی دەکرێ؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش لەدوو خاڵی سەرەکیدا ئامانجەکانی جەنگ و جیهادمان لەئیسلام دا ڕوون کردۆتەوە، کەبریتین لە:

أ- بەربەرچدانەوەی دەستدرێژی ئەهلی کوفر.

ب- ڕێگا تەخت کردن لەبەردەم گەیاندنی پەیام و بانگەوازی ئایینی خوادا بۆ بەرپاکردنی شەریعەت و بەرنامەی خوا لەژیان و گوزەرانی کۆمەڵگادا.

سێیەم: جیهاد چۆن دەکرێ؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش حەوت خاڵمان نووسیون تاکو شێوەو چۆنیەتی ڕاست و دروستی جەنگ و جیهادکردن ڕوون و ئاشکرا بێت، چونکە نەك هەر جەنگ و جیهاد بەڵکو هەر ئەرك و کارێکی دیکەی شەرعیش وەك چۆن لەخودی خۆیدا هەق و ڕاستە، پێویستە بەشێوەو چۆنیەتییەکی ڕاست و دروستیش جێبەجێ بکرێ، هیچ کاتێك شەرعیی بوونی کارێك شەفاعەت بۆ ناشەرعیی بوونی چۆنیەتی و شێوەی ئەنجام درانەکەی ناکات و قەرەبووی ناکاتەوە! خوای کاربەجێش تبارك وتعالى فەرموویەتی:

(وَبِالْحَقِّ أَنْزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ) (الاسراء:١٠٥)

واته: وەئێمە قورئانمان بەشێوەیەکی هەق ناردۆتە خوارێ و هەقیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە خوار! واتە: قورئانی بەڕێز هەم لەزاتی خۆیدا هەق و ڕاست و بەجێیەو هەم بەجۆرو چۆنیەتی یەکی هەق و ڕاست و بەجێش لەلایەن خوای کاربەجێوە نێرراوەتە خوار.

پاشان لەژێر ناونیشانی: (چەند قسەیەکی دڵسۆزانە بۆ حوکمڕانەکانی کوردستان)دا لەسێ خاڵی کورت و گوشراودا چەند ئامۆژگاریی یەکم ئاڕاستەی لایەنە سیاسی یە لائیکەکانی کوردستان بەگشتی و هەردووک ئیدارەکەی هەولێرو سلێمانی دا بەتایبەت، کردوە لەسەر چۆنیەتی هەڵس وکەوت و مامەڵەیان لەگەڵ ڕەوتی ئیسلامیی دا، کەپێم وایە ئەگەر ئەو قسەو ئامۆژگاریی یانەم لێوەربگرن گەلێک گرفت و کێشەی لابەلا لەکۆڵ هەموو لایەکمان دەبێتەوەو لەهەر شەڕو گێچەڵێکی (نەوەن بەئاش) پارێزراو دەبین، بەڵام خوا نەکردە ئەگەر بەپێچەوانەوە بێ و قسەو ئامۆژگاریی دڵسۆزانەی یەکتر وەرنەگرین و پەندو عیبرەتیش لەخەڵکی دیکە وەرنەگرین، ئەوە بارودۆخێکی دێتە کایەوە کەلەجیاتی بەرەو پێش بردنی گەلمان و ئاوەدان کردنەوەی وڵاتمان و پارێزگاری لێکردنی قەوارەو ئەزموونە لەرزۆک و لەتکراوو دانەمەزراوو هەڕەشەی جۆراوجۆر لێکراوەکەمان و چارەسەرکردنی کێشەو قەیرانە جۆراوجۆرەکانی: فەرهەنگی و ئابووریی و ئیداریی و ئەخلاقیی و.. هتد مان دەبێ دەست بدەینە یەخەی یەکدی و دوژمن و ناحەزانی هاوبەشمان بەخۆمان خۆش بکەین و بەدەستی خۆمان گۆڕ بۆ خۆمان لێبدەین و ئایەتی: (.. يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ بِأَيْدِيهِمْ..) (الحشر: ٢) بەسەر خۆمان دا بێنینەدی!

ئیدی خوێنەری بەڕێز!

تۆو ئەم ئامیلکەیە کەپێم وایە ئەگەر بەوردی بخوێندرێتەوەو باش سەرنج بدرێ و فەهم و هەزم بکرێ، ڕێگا لەزۆر جۆرە بیروبۆچوونی هەڵەو هەڵس وکەوت و هەڵوێستی کرچ و کاڵ و زیانبەخش دەگرێ، بەڵام پێویستە ئەو ڕاستیی یەش بزانرێ کە ئەم ئامیلکەیەو سێ هاوەڵەکەی دیکەی کەلێن پڕکەرەوەو تەواوکەری یەکدین.

# دەقی وتارەکەی مزگەوتی جیهاد کە لەرۆژی (٢)ی شەعبانی ١٤٢٢ك بەرانبەر ١٩/١٠/٢٠٠١ ز دا دراوە

پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، واشهد أن لا اله الا الله وحده لاشريك له وأشهد ان محمداً عبده ورسوله، فَصَلِّ اللهم وسلم وبارِكْ عليه وعلى آلِهِ أجمعين مِنَ الصَّحْبِ والقَرابةِ والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين، أما بعد:

أوصيكم أيها المسلمون وقبلكم نفسي بتقوى الله، قال عزَّ مِنْ قائلٍ في مُحْكَمِ كتابه:

(ياءيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولاتموتن الا وانتم مسلمون).

مسوڵمانە بەڕێزو خۆشەویستەکان، برایانو خوشکان! لەوتاری ئەمڕۆماندا باسی (جیهاد لەڕێی خوادا) دەکەین، جیهاد لەڕێی خوادا چی‌یە؟ بۆچی دەکرێت؟ چۆن دەکرێت؟

چونکە هەموو لایەك ئاگادارین کە لەم رۆژانەدا چ هێرشێکی ڕاگەیاندنی توند لەسەر ئیسلامی‌یەکان بەگشتیو لەسەر جەنگو جیهاد لەئیسلامدا بەتایبەتی هەیە.

بێگومان ئێمە نکووڵی‌مان لەوە نیە کەمسوڵمانان بەگشتی وە بەتایبەتی ئیسلامی‌یەکان – کە دەیانەوێ شەریعەتی خوا بێنێتەوە سایەو سێبەری میللەتی مسوڵمان، کە بێگومان هەر ئەوەش لەمیللەتی مسوڵمان دەوەشێتەو کە لەژێر سایەی شەریعەتی خوادا بژین – بەڵێ ئێمە نکووڵییمان لەوە نیە کەمسوڵمانان بەگشتی وەئیسلامی‌یەکان بەتایبەت[٢] کەموکوڕی‌یان هەیە، ئێمە هەمیشە گوتوومانە ئاینو شەریعەتی خوا کامڵو تێرو تەواو و بێ‌هەڵەو پەڵەیە، بەڵام

[٢] بۆیە گوتوومە: ئیسلامی‌یەکان بەتایبەت، چونکە بێگومان (ئەو کەسە هەڵە ناکات کەهیچ ناکات) جا لەسۆنگەی زیاتر جووڵانەوە کۆمەڵو جموجۆڵە ئیسلامی‌یەکان لەخەڵکی دیکە زیاتر ئەگەری گیرۆدەبوونی هەڵەو خلیسکانیان هەیە.

هیچ کات ئیدیعای ئەوە نەکراوە کەمسولمانان کەموکورپییان نییەو کرچ و کاڵییان نییەو بەتایبەت لەبواری بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئەهلی کوفر، وە ئەنجامدانی جەنگو جیهاددا، کەبەڕاستی ئەگەر ئینسان زۆر لەخۆی وریا نەبێت وە زۆر شارەزا نەبێت لەشەرع، وە زۆر چاکیش پەروەردە نەکرابێ و تەزکیە نەکرابێ لەسەر بنچینەی قورئان و سوننەت، تووشی لادان و خلیسکان دەبێت و حەماسەت و دڵ گەرمی، عاتیفەو هەڵچوون وای لێدەکەن کە تێپەڕێنێ، وە لەشێرازەو سنووری شەرع دەربچێ.

بەلاّم کەموکوڕیی و خلیسکان و بەهەڵەداچوون شتێکە، وە زەپب بەسەرداهێنان شتێکی دیکەیە.

کەسانێک دەیانەوێ کە لەپەنای هەڵەی دوو مسولمان، هەڵەی کۆمەڵێک، هەڵەی چەند کەسێکدا، بیانوو و پاساوی ئەوە دەست خۆیان بخەن و چاوپێچکێکی پێ دروست بکەن چاوی میللەتی پێ بپێچن و خەڵکی پێ چەواشە بکەن، کەبڵێن مادام فلاّن مسولمانە هەڵەی کرد، مادام فلاّن ئیسلامییە بەهەڵەداچوو، مادام فلاّن دەستەو تاقمەیە لەئیسلامییەکان شتێکی کرد کەهەڵەیەو نەزانانەیەو لەشێرازەی شەرع چۆتە دەرێ، کەواتە خەڵکینە! ئیسلام هەمووی هەڵەیەو ئیسلامییەکان هەموویان هەڵەن و مسولمانان هیچیان بەکەڵک نایەن!!

کەبێگومان ئەوجۆرە بیرکردنەوەیە یەکجار بێ ماناو نامەقووڵ و هەڵەیە، چونکە ئەوە وەك ئەوە وایە کە باخێك درەختەکانی هەمووی میوەی باشی پێوەبێ و پڕ بەرەکەت بێ، بەلاّم چەند درەختێك لەو باخەدا هەندێك میوەیان پێوە بێت کە کرمۆڵ بێ یا نەخۆشی لێیدا بێت یا بەکەڵك نەیەت تۆ بێێی حوکمێکی گشتی بەسەر ئەو باخەدا بدەی کەهیچی بەکەڵك نایەت، کەبێگومان ئەوە بێویژدانییە، وە بەو پێیە بێت هیچ کەس سەلامەت دەرناچێت!

بەهەر حاڵ من بۆتان باسی جەنگو جیهاد دەکەم، لەئیسلام دا چییە؟ جیهاد بۆچی دەکرێت؟ وە چۆن دەکرێت؟ وە پاشان لەکۆتایی وتارەکەمدا ڕوودەکەمەوە لایەنە سیاسییەکانی کوردستان – برادەرانی عەلمانی – وە هەندێك ئامۆژگاری دڵسۆزانەیان ئاڕاستە دەکەم سەبارەت بەمامەڵە کردنیان و چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردنیان لەگەڵ ئەهلی ئیمان و ئەهلی ئیسلام دا.

# ١-جیهاد چییەو چ پلەو پایەیەکی لەئیسلام دا هەیە؟!

وشەی (جیهاد) لەزمانی عەرەبیدا یان لە (جَهْد)ەوە هاتوە واتە: مەشەققەت و ناڕەحەتی و سەختیی، یان لە (جُهْد)ەوە هاتوە واتە: تاقەت و تواناو وزە، واتە جیهاد یان بەمانای تەحەممول کردنی سەختی و ناڕەحەتی دێ، یان بەمانای سەرف کردنی جوهدو وزەو توانا دێ[٤].

ئەوە مانای وشەی (جهاد) لەئەسڵی زمانی عارەبیدا.

ئەدی لە پێناسەی شەرع داو لەڕوانگەی شەرعەوە جیهاد یانی چی؟!

لەئایەتەکانی قورئاندا وە لەفەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ وشەی (جهاد) جاری وا هەیە بەمانای فراوان بەکارهاتووە، واتە بەکارهێنانی هەرجۆرە وزەو توانایەك لەپێناوی دینی خوادا، بەتایبەتی لەئایەتە مەککی‌یەکاندا هەرکاتێك وشەی (جهاد) بەکارهاتبێ مەبەست پێی بەکارهێنان و سەرف کردنی هەرچی وزەو توانایە لەڕووی بانگەوازەوەو لەڕووی دۆستایەتی و دوژمنایەتی‌یەوەو لەڕووی ماڵ سەرف کردنەوە لەپێناوی خوادا، ئەمە مانای گشتی وشەی جیهادە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (.. وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَاداً كَبِيراً) (الفرقان: ٥٢) واتە: (بەم قورئانە جیهادێکی گەورە لەگەڵ هاوبەش پەیداکەرەکاندا بکە) واتە: لەمەیدانی وتووێژو بانگەواز و ڕووبەڕووبوونەوەی فیکریی‌دا.

وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (جاهدوا المشركين بأموالكم وأنفسكم وألسنتكُمْ)[٥] واتە: جیهاد لەگەڵ موشریکەکاندا بکەن بەزمانتان بەماڵتان بەدڵتان.

بەڵام ئەوەی کەشەریعەتی ئیسلامی دوایی بۆ ماناو مەبەستی وشەی جیهاد (تَبَنّي)ی کردوەو هەموو شەرعزانەکان لەسەری پێك هاتوون ئەوەیە کەوشەی (جهاد) واتە جەنگ (قتال) و کوشتار لەپێناوی خوادا:

١-(کاسانی) خاوەنی کتێبی (بدائع الصنائع) کە یەکێکە لەکتێبە موعتەبەرەکانی مەزهەبی حەنەفی، لەو بارەیەوە دەڵێ: (الجهادُ بَذْلُ الوُسْعِ والطاقةِ في سَبيل الله عزَّ وجَلَّ بالنَّفسِ والمالِ واللسانِ وغَيْرِها)[٦] واتە: (جیهاد ئەوەیە کەنەفس و ماڵ و

---

[٤] وەك لە (القاموس المحيط) و (لسان العرب) دا هاتوە.

[٥] رواه أبوداود والنسائي واحمد وهو صحيح بروانه: (مشارع الأشواق الى مصارع العشاق) ج١ص٢٦، لأبن النحاس.

[٦] (بدائع الصنائع) بەرگی -٧- لاپەڕە ٩٧.

زمان‌و هەموو شتێکت لەپێناوی خوادا بخەیە کار یانی: لەپێناوی خـوادا خـەبات بکەی و جەنگ‌و کوشتار بکەی).

٢-هـەروەها (ابن عابدین) لـە (حاشیة)ی خۆیدا کەکتێبێکی ناوداری مەزهـەبی ئـەبوو حەنیفەیـە، دەڵـێ: (الجِهادُ: بَذْلُ الوُسْعِ فِي القِتـالِ فِي سـبيلِ اللهِ مُباشـرةً أو مُعاونَةً)[7] واتە: (جیهاد بریتیە لەسەرف کردنی توانا لەجەنگ دا لەپێناوی خوادا بەڕاستەوخۆ خۆت بیکەی یاخود پشتگیری کەسـانێک بکـەی‌و یارمـەتی کەسـانێک بدەی کەدەیکەن) وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (مَنْ جَهَّزَ غازِيـاً فـي سبيل الله فَقَـدْ غَـزا ومَنْ خَلَفَ غازِياً في أهْلِهِ بخير فقدْ غزا)[8] واتە: (هەر کەسێك جەنگاوەرێکی ڕێی خوا چەکدار بکـات‌و بـەماڵ یارمـەتی بـدات وەك خـۆی جیهادی کردبێ وایـە هــەروەها هەرکەسێك چاودێریی‌و سەرپەرشتیی دڵسۆزانەی ماڵ‌و خێزانی موجاهیدێك بکات، ئەویش بەجیهادکەر دادەنرێ).

٣-(شیرازی) لە کتێبی (المهذب)دا کە کتێبێکی زۆر موعتەبەری مەزهـەبی ئیمام شافیعی‌یە، دەڵێ: (الجِهادُ: هو القِتالُ في سبيلِ الله)[9] واتە: (جیهاد بریتی‌یە لەجەنگ لەپێناوی خوادا).

٤-(قسطلاني) لەشەرحێك کە لەسەر (بُخاري) کردوویەتی دەڵێ: (الجهاد: قِتالُ الكُفَّارِ لِنُصْرةِ الأسلامِ وإعلاءِ كلمة الله)[10] واتە: (جیهاد بریتیە لەجەنگ کردن لەگەڵ کافرەکان بۆ سەرخستنی ئیسلام‌و بەرزکردنەوەی ناوی خوا وە بەرنامەو پەیامی خوا).

ئەوە بەکورتی پێناسـەی جیهاد لەئەسڵی زمـان‌و لـەزاراوی شـەرع دا، بۆئـەوەی خـەڵکێك دوایی بانگەوازکردن‌و پەروەردەکردن‌و ماڵ بەخشـینێك‌و قسـەیەکی خێـر بەمانای جەنگ‌و جیهاد لێك نەداتەوە،[11] بەڵێ وشەی جیهاد لەئایەتە مەدەنی‌یەکاندا وە بەپێی ئەو پێناسەی کە زانا‌و شەرعزانانی ئیسلام لەسەری ڕێك کەوتوون، جیهاد یانی جەنگ (قتال) لەپێناوی خوادا، هەرچەندە لەئایەتە مەککەیی‌یەکان وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە ماناکەی فراوانترە.

---

[7] (حاشية لابن عابدين) بەرگی (٣) لاپەرە ٢٢٦.

[8] رواه البخاري ومسلم، بڕوانە: (مشارع الأشواق الى مصارع العُشاق) ج١ص٢٠٤.

[9] (المهذب) بەرگی -٢- لاپەرە ٢٢٧.

[10] (قسطلانی) لەشەرحی بخاری‌دا بەرگی - ٥- لاپەرە ٣٠.

[11] چونکە هەندێك کەس حەز دەکات بەئەهلی (جیهاد) دابنرێ‌و بۆشی ناکرێ‌و لەو سۆنگەیەوە جۆرە چەمك‌و واتایەك بۆ جیهاد لەبیرو زەینی خۆیدا دادەتاشێ کەهەر جۆرە چالاکی‌و جموجۆڵێك بگرێتەوە!

## ٢- پلەو پایەی جەنگو جیهاد لەئیسلامدا

ئەمجار پێویستە بزانین کە جەنگو جیهاد لەپێناوی خوادا پلەو پایەیەکی هەیە هیچ عیبادەتێك نایگاتێ، وە ئەمە زۆربەی هەرەزۆری زانایان لەسەری یەك دەنگن، بۆ نموونە:

(ابن حجر العسقلاني) خاوەنی (فتح الباري) دوای ئەوەی ئەم فەرموودەیەی هێناوە کەدەڵێ: (عن أبي ذر رضي الله عنه قال: سألتُ النبيّ ﷺ أيُّ العمل أفضلُ قال: إيمانٌ بالله وجهادٌ في سبيله)[١٢] واتە: (ئەبوو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: لەپێغەمبەرم پرسی ﷺ چ کردەوەیەك لەئیسلامدا لەهەموو کردەوەیەك گەورەترو چاکترەو پاداشتی زیاترەو لەلای خوا خۆشەویستترە؟! پێغەمبەر فەرمووی: ئیمان بەخوا وەجەنگ کردن لەپێناوی‌دا) کەواتە لەدوای ئیمان جەنگو جیهاد گەورەترین تاعەتو عیبادەتە کەمسوڵمانان بەهەرەوەزیو بەیەکەوە ئەنجامی دەدەن.

دیارە ئەم فەرمایشتە ناکۆکی نیەو تێك ناگیرێ لەگەڵ فەرمایشتی دیکەو ئایەتی دیکەدا کە مەدحو ستایشی عیبادەتو تاعەتی دیکە دەکەن، چونکە لەفەرموودەیەکدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (چاکترین کردەوە نوێژە لەکاتی خۆی‌دا) (الصلاة على وَقْتِها) وەك لە (صحيح)ی (بخاري و مسلم)دا هاتوە، چونکە فەرموودەی یەکەم ڕووی لەکردەوە کۆمەڵی‌یەکانو ئەم فەرموودەیەش ڕووی لەعیبادەتە شەخسی‌یەکانە، بەڵێ ئینسانی مسوڵمان وەك شەخس گەورەترین عیبادەتی نوێژە، مسوڵمانانیش وەك کۆمەڵو جەماعەت گەورەترین عیبادەتیان جیهادە. وە ئەوەندە بەسە بۆ پلەو پایەی بەرزی جەنگ و جیهاد لەپێناوی خوادا کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ) (التوبة: ٢٤)

---

[١٢] متفق عليه.

واتە: (ئەی محمد بە ئۆممەتەکەت بفەرموو: ئەگەر باوکانتان، وە کوڕانتان، وە براکانتان، وە هاوسەرانتان، وە خزم و عەشیرەتتان، وە ماڵ و سامانتان، وە بازرگانی یەکتان کەدەترسێن زەرەر بکات، خانوو بەرەیەك کەزۆر دڵتان پێیەوە بەندە، لەلاتان خۆشەویستترن لەخواو پێغەمبەرەکەی و جیهاد لەرێ - خوا - دا، (یانی: هەموو ئەوانەتان لەتا تەرازوویەکدا دانابێ، ئیمان بەخواو پێغەمبەر ﷺ و جیهاد لەپێناوی خواش دا لەتەرازوویەکدا داندرابێ ئەگەر تا تەرازووی ئیمان و جیهادی رێی خوا قورستر نەبوو) ئەوە (فَتَرَبَّصوا حتّى يأتيَ اللهُ بأمرِه) چاوەڕێ بن تا فەرمانی خوا دێت، واتە فەرمانی خوا دێت بۆئەوەی تۆڵەتان لێبستێنێ و سزاتان بدات لەسەر ئەوجۆرە مسوڵمانەتی یەی کەسەرەکێشێ بۆ واز لەجەنگ و جیهاد هێنان و هەڵخزان! دیارە جێی سەرنجیشە کەخوای کاربەجێ لێرەدا ئەو هەشت شتانەی بە (و) ی (عطف)یش (عطف)ی کردوونەوە، واتە دەبێ لەیەك کاتدا ئیمان بەخواو بەپێغەمبەری خوا ﷺ وە جیهاد و جەنگ لەپێناوی خوادا بۆ بەرزی ئاڵای دینی خوا، لەلای مسوڵمان شیرینتر بێ و خۆشەویستتر بێ لەباب، لەکوڕ، لەبرا، لەهاوسەر، لەخزم و عەشیرەت، لەپارەو سامان، لەبازرگانی و مامەڵە، لەزەوی و زارو خانوو بەرەو نیشتمان، واتە لەهەموو شتێك، دەبێ جیهاد لەپێناوی خوادا لەکاتێکدا کەپێویست دەبێ لەلات لەهەموو شتێك خۆشەویستتر بێ و بەسەر هەموو شتێکدا هەڵبژێری و هەموو شتێکی بەقوربان بکەن هەموو شتێکی لەپێناودا بەخت بکەی، ئەوجار ئیسپاتی دەکەی کەخواو پێغەمبەری خوات لەخۆت و لەهەموو کەس و شتێك خۆشتر دەوێن، ئەوجار ئیسپاتی دەکەی کەبەڕاستی بەندەی خوای، نە بەندەی خزم و عەشیرەتی، نە بەندەی ماڵ و سامانی، نەبەندەی زەوی و زارو نیشتمانی نە بەندەی هیچ شتێکی، بەڵکو بەندەی خوای، (لا الـه الا الله) یانی چی؟ هیچ پەرستراوێك نییە جگە لەخوا، واتە هیچ شتێك نییە من لەهەموو کەسم خۆشتر بوێ و لەهەموو کەس بەگەورەتری بزانم بۆی مل کەچ بم و لەبەرانبەری دا خۆم پێ بچووکتر بێ، هیچ کەس و هیچ شتێك نیە ئەوەی بۆ بکەم جگە لەخوا (جل جلاله).

جا با تەماشا بکەین! خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا کەباسی ئیمان دەکات دەفەرموێ: (أَحَبَّ إِلَيْكُم مِنَ اللهِ وَرَسُولِهِ) دەبێ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ لەلات خۆشەویستتر بن لەئەو شتانە لەهەموویان، بەڵام کەدوایی باسی جیهاد دەکات دەفەرموێ: (وجهادٍ في سبيله) جیهادێك لەپێناوی خوادا، چونکە جیهاد لەپێناوی پێغەمبەردا نیە ﷺ پێغەمبەریش جیهادی لەپێناوی خوادا کردوە، جیهاد عیبادەتە عیبادەتیش تەنیا بۆ خوا دەکرێت، تاعەتە تاعەتیش لەئەسڵ دا بەس بۆ خوا ئەنجام دەدرێت،[12] بەندایەتی تەنها بۆ خوا دەکرێت، پێغەمبەریش ﷺ کە سەروەری پێغەمبەرانەو چاکترین بەندەیە لەبەرئەوە بووە کە لەهەموو کەس عەبدتر بووە بۆ خوا، لەهەموو کەس بەندایەتی چاکتری کردوە بۆ خوا تبارك وتعالى.

ئنجا با بزانین موجاهیدان چۆنن؟! ئەوە پلەو پایەی جیهاد بەم شێوەیە بوو کە باسمان کرد، بەڵام ئایا موجاهیدان ئەوانەی بەئەرکی جیهاد هەڵدەستن چ پلەو پایەیەکیان هەیە؟!

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا، دَرَجَاتٍ مِنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) (النساء:٩٥-٩٦)

واتە: ([13]ئەو بڕوادارانەی کەبەبێ ئەوەی عوزریان هەبێت دانیشتوون یەکسان نین لەگەڵ ئەو بڕوادارانەی کە بە ماڵ و سامان و گیانی خۆیان لەڕێی خوادا جەنگ و جیهاد دەکەن، خوا جیهادکەرانی بەسامان و گیانیان پلە یەك (ی

---

[12] واتە خوا کە فەرموویەتی: (.. أطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ..) (النساء: ٥٩). ئەسڵی فەرمانبەریی بەس بۆ خوایە فەرمانبەریی‌کردنمان بۆ پێغەمبەر ﷺ و میراتگرانیشی (بالتَّبَع)ە و بۆیەیە کە بەندایەتی بۆ خوا ئەنجام بدەین بەهۆی شوێن پێهەڵگرتن و چاولێکردنی ئەوانەوە کەبەمانای وشە بەندایەتی و فەرمانبەرایی‌یان بۆ خوا تێدا بەرجەستەو نمایان بووە.

[13] بەم شێوەیە وەسفی هیچ کۆمەڵێك نەکراوە لەکتێبی خوای پەروەردگاردا.

گەورە) بەسەر دانیشتووان بەرز کردۆتەوە، وە خوا گشتی پاداشتی زۆرباشی بەهەموویان داوە، بەڵام خوا بەپاداشتێکی مەزن موجاهیدانی بەسەر دانیشتوان دا هەڵبژاردوە، چەندان پلەی بەرزی لەلایەن خۆیەوە پێ بەخشیون وێڕای لێبوردن و بەزەیی تایبەت، وە خوا هەر لێبوردەو بە بەزەیی بووە).

پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە – واتە لەبارەی مەدح و وەسفی موجاهیدانی ڕێی خواو پاداشتی زۆرو پلەو پایەی بەرزو ئاوازەیانەوە فەرمایشتی زۆرن بۆ وێنە ئەم فەرموودەیەی کەهەر شەرح و تەفسیری ئایەتەکانی (٩٥ و ٩٦) ی سوورەتی (النساء)ە، دەفەرموێ:[١٤] (مَنْ آمن بالله ورسوله وأقام الصّلاة وآتــي الزكــاة[١٥] وصام رمضان كان حقاً على الله أن يُدْخِلَهُ الجَنّةَ هاجَرَ في سبيل الله أو جَلَس في أرْضِهِ الـتي وُلِدَ فيها، قالوا: يارسول الله! افلا نُنَبيء الناسَ بذلك؟ قال: إنَّ في الجنّة مائة درجةٍ أعدّها الله للمجاهدين في سبيل الله مابين الدّرجَتين كما بين السّماءِ والأرض..) رواه البخاري عن ابي هريرة رضي الله عنه.

واتە: هەرکەسێك بڕوا بەخواو پێغەمبەرەکەی بهێنێ و نوێژ بەرپا بکات و زەکاتی بدات و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ، ئەوە خوا لەسەرخۆی پێویست کردوە کەبیخاتە بەهەشتەوە، جا چ لەڕێی خوادا کۆچی کردبێ، یان لەو سەرزەمینەدا دابنیشێ کەتێیدا لەدایك بووە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا ئەو مەسەلەیە بەخەڵکی ڕابگەیەنین؟ فەرمووی: (هەرچەندە ئەوەی گوترا وایەو هەموو مسوڵمانێکی باش دەچێتە بەهەشتێ) بەڵام بێگومان لەبەهەشتێدا سەد پلەی بەرز هەیە کەخوا بۆ جەنگاوەرانی ڕێگای خۆی ئامادەی کردوون نێوان هەردوو پلە (لەو سەد پلە بەرزە) هێندەی دووریی نێوان ئاسمان و زەمینە.

---

[١٤] بڕوانە: (مشارع الأشواق الى مصارع العُشاق)ی ابن النحاس ج١ص١٦٢.

[١٥] ئەم ڕستەیە (وآتی الزكاة) لە (صحيح البخاري) دا نیەو لە (سنن)دا هاتوە، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ و لاپەڕە.

# ٣-جیهاد بۆچی دەکرێت؟!

بانگەشە و پڕوپاگەندەی ناحەزانەو دڵڕەشانە بەرانبەر بەئیسلام، ئەمڕۆ بەرانبەر بەجیهادەکەی، ڕۆژێکی دیکە بەرانبەر بەحوکمو سیاسەتی، ڕۆژێکی دیکە بەرانبەر بەئاداب و ڕەوشتەکانی، ڕۆژێکی دیکە بەرانبەر بەدروشمەکانی، پڕوپاگەندەی دڵڕەشانەو ناحەزانە زۆرە، نەك هەر لەلایەن کوفری جیهانییەوە بەڵکو لەلایەن کەسانێکیشەوە کەخۆیشیان پێ‌مسوڵمانەو ئیدیعای مسوڵمانەتی دەکەن کەچی وەك مەلای مەزبوورە ئەو لقە درەختەی کە لەسەری وەستاون دەیبڕنەوە!! کەسێك ڕەخنە لەدینی خوا بگرێ چۆن دەتوانێ خۆی بەمسوڵمان بزانێت! مەگەر لای خەڵکی نەفامو نەزان، ئەگەرنا یەکێك لەئایەتەکانی خوات پێ‌هەڵەبێ، یەکێك لەحوکمەکانی شەریعەتی خوات پێ‌هەڵە بێ، کە بەئاشکرا زاندراون، پێی کافر دەبی!، جا کافربوونیش گەورەو بچووکی نازانێ، کوفر کردن‌و شیرك کردن، کوفر گوتن‌و شیرك گوتن، کابرا گەورە بێ یا بچووك بەڵکو ئەگەر گەورە بێ زووتر کافر دەبێ، چونکە زیاتر مەجالی هەیە شارەزا بێ‌و تێبگات، وە ئەگەر گەورەبێ خەڵکێکیش لەگەڵ خۆی کافر دەکات‌و کوفرەکەشی تۆختر‌و خراپترە، وە مەلا و غەیرە مەلاش نازانێ بەڵکو مەلا لەهەموو کەس زووتر کافر دەبێ، ئەگەر کوفر بکەن‌و کوفر بڵێن، ئەگەر شیرك بکەن‌و شیرك بڵێن ئەگەر خەسڵەتەکانی نیفاقی گەورە لەخۆیاندا بهێننەدی، لەهەموو کەس زووتر کافر دەبێ، چونکە کابرایەکی عەوام‌و نەزان ڕەنگە بەعوزر بەجەهل - واتە بیانووی ئەوە کەنازانێ - بپەڕێتەوە، دیارە هەموو کەسیش بەعوزر بەجەهل ناپەڕێتەوە، بەلام هەندێك خەڵکی سادەو نەزان دەپەڕێتەوە، بەلام مەلایەك چۆن بەعوزر بەجەهل دەپەڕێتەوە؟! کەسێك خۆی بەسەرکردەیەك بزانێ چۆن بەبیانووی ئەوەی کەنەمزانی دەپەڕێتەوە؟! دەیتوانی بزانێ، ڕەنگە بشزانێ، بەهەرحاڵ با بزانین ئامانجی جیهادکردن چی‌یەو جیهاد بۆچی دەکرێ؟!

جیهاد لەپێناوی خوادا بەشێوەیەکی گشتی بۆ دوو[١٦] مەبەست دەکرێت:

**یەکەم: (بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی ئەهلی کوفر بۆ سەر ئەهلی ئیمان).**

ئەو دەستدرێژی‌یە بۆ سەر دینیان بێت، بۆ سەر ماڵ و سامانیان بێت، بۆ سەر نەفس و خوێنیان بێت، بۆ سەر ئابڕوو و کەرامەتیان بێت، بۆ سەر زەوی و نیشتمانیان بێت، بۆ سەر هەر شتێك لەو شتانە بێت، جیهاد دەکرێ لەلایەن مسوڵمانانەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو دەستدرێژی‌یە، تاکو دینی مسوڵمانان سەلامەت بێت، خوێنیان پارێزراو بێت، ماڵ و سامانیان پارێزراو بێت، کەرامەت و ئابروویان پارێزراو بێت نیشتمان و وڵاتیان پارێزراو بێت.

بەڵێ، بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژکردنی دەستدرێژکاران، یەکێکە لەدوو ئامانجەکەی جیهاد.

چەند ئامانجێکی ڕەوایە، نەك هەر لەڕوانگەی ئیسلامەوە، بەڵکو هەموو خاوەن عەقڵ و ویژدانێك، هەموو خاوەن شەهامەتێك دەڵێ: (اشهد بالله) کەسێك دەستدرێژی بکاتە سەر عەقیدەو دینم، سەر ماڵ و سامانم، سەر ئابڕوو و کەرامەتم، سەر نەفس و گیانم، سەر خاك و نیشتمانم، پێویستە کەبەرپەرچی دەستدرێژی‌یەکەی بدەمەوە و زوڵم و ستەمی لێ‌قبووڵ نەکەم!

چ خاوەن عەقڵێك و چ خاوەن ویژدان و خاوەن شەهامەتێك هەیە بڵێ نەخێر ئەگەر دەستدرێژی‌یەکیان کردە سەرت، دەبێ ملیان بۆ دانەوێنی؟! مەگەر ئینسانێکی بوودەڵەو پووچەڵ، ئەگەرنا هیچ کەس بەوە ڕازی نابێ.

---

[١٦] چونکە مسوڵمانان بەگشتی لەهەر کات و شوێنێکدا دوو حاڵەتیان هەن: یەکەم: لەقۆناغی دەوڵەت دابن، دووەم: لەقۆناغی دەعوەت دابن، جا بێگومان دەوڵەتی ئیسلام پێویستی بەپارێزگاریی لێکردن و فراوان کردن هەیە، ئەمجا هەموو سەرزەمینی خوا دەگرێتەوەو سەرجەم مرۆڤایەتی لەژێر سایەیدا بەختەوەر دەبن و دەحەوێنەوە، وە بانگەواز (دعوة)یش پێویستی بەبڵاوبوونەوەو زەمینە بۆ خۆش کردن و ڕێگا بۆ تەخت کردن هەیە، بۆیە گوتوومانە: ئامانجی جیهاد و جەنگ لەئیسلامدا بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی دوژمنان و، ڕێگا تەخت و ئاجووخ کردن بۆ بانگەوازو پەیامی خوایە.

کەواتە ئیسلامیش رازی نابێ کەمسوڵمانان پووچەڵ و بوودەڵەو سەرکزو سەرنەوی بن، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُم..)(البقرة: ١٩٠).

واتە: (لەرێی خوادا بجەنگن لەگەڵ کەسانێك کە لەگەڵتان دەجەنگن) مادام شەڕتان پێدەفرۆشن، ئەو شەڕە لەسەر (دین)تان بێ یا لەسەر (ژین)تان بێ، لەگەڵیاندا بجەنگن، واجبە لەسەرتان و فەرزە، وەك چۆن نوێژ فەرزە جەنگیش فەرزە، خوای پەروەردگار کەدەفەرموێ: (.. إِنَّ الصَّلاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَوْقُوتاً)(النساء: ١٠٣). نوێژ لەسەر مسوڵمانان نووسراوەو کاتی بۆ دیاری کراوە.

بەهەمان شێوەش دەفەرموێ: (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ..) (البقرة: ٢١٦) هەروەك دەشفەرموێ (.. كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ..) (البقرة: ١٨٣) هەمووی وەك یەك لەلایەن خواوە واجب کراوە.

وە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (.. فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ ..)(البقرة: ١٩٤) واتە: (هەر کەسێك دەستدرێژی کردنە سەر چۆن دەستدرێژیتان دەکاتە سەر ئاوا دەستدرێژی بکەنەوە سەر) واتە بەرپەرچی دەستدرێژییەکەی بدەنەوە، مەهێڵن تەعداو زوڵمتان لێبکرێ، بەمەزلوومیەت رازی مەبن، بەماف لێ زەوت کران و زۆر چەپۆکی رازی مەبن، بۆچی؟! چونکە تۆ دەڵێی: من بەندەی خوام، کەبەندەی خوای نابێ بەخزمەتکاری هیچ تاغووت و فیرعەونێك رازیبی، نابێ بەزۆر چەپۆکی هیچ دیکتاتۆرێك رازی بی، کەبەندەی خوای دەبێ جگە لەدینی خواو شەریعەتی خوا قبووڵ نەکەی هیچ بەرنامەیەکی دیکە بەسەر تۆوە حاکم بێ، تۆ ناڵێی من بەندەی خوام، بەندایەتی بۆ خوا هەر ڕکووع و سەجدە نیە، ئەو ڕکووع و سەجدەیە بۆئەوەیە کەئیسپاتی بکەی کەمسوڵمانی، ئەو ڕکووع و سەجدەیە دروشم و نیشانەی ئەوەیە کەتۆ خواپەرستیی، بەڵام خواپەرستیی لەڕکووع و سەجدەدا کورت هەڵنەهاتوە، ڕکووع و سەجدەو نوێژکردن و ڕۆژوو زەکات و حەج و زیکرو پاڕانەوە و لەژیانی

ئینساندا ماوەیەکی زۆر کەم دەگرن، وە بەندایەتی کردن بۆ خوا تەنیا لەمزگەوتیدا نایەتەدی، تەنیا بەنوێژکردن و ڕۆژووگرتن نایەتە دی، ئەو هەموو ئایەتانەی قورئان ئەو هەموو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ کە پەیوەندی‌یان بەهەموو لایەنەکانی ژیان و گوزەرانەوە هەیە بەتاك و کۆمەڵەوە، بۆئەوە هاتوون تاکو جێبەجێ بکرێن، بۆئەوە هاتوون کەئینسان لەهەموو لایەنێکەوە مل کەچی شەریعەتی خوا بێت، لەڕووی تاعەت و عیبادەتی شەخسی، لەڕووی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان، لەڕووی ئاداب و ڕەوشتەکان، لەڕووی حوکم و سیاسەت، لەڕووی دادگایی و قەزا، لەڕووی کڕین و فرۆشتن و مامەڵەو بازرگانی، لەهەموو ڕوویەکەوە تۆ دەبێ بەندەی خوابی، کاتێك بەندەی خوا دەبی کەمل کەچی شەرعی خوا بی.

وە خوای پەروەردگار بەکەسانێکی فەرمووە کە لەهەندێك شتدا بەقسەی خوا دەکەن و لەشتەکانی دیکەش دا بەقسەی خوا ناکەن: (.. أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ..)(البقرة: ٨٥) واتە: (ئایا ئیمانتان بەهەندێك لەکتێبی خوا هەیە ئیمانیشتان بەهەندێکی دیکە نیەو کوفری پێ دەکەن؟!).

ئەوە نابێ، مسوڵمان دەبێ لەهەموو شتێکدا بەندەی خوا بێ، ئیمانی بەشەریعەتی خوا هەبێ بەتەواوی ئەوەی کەناردوویەتی، وەهەروەڵیش بدات هەمووی پیادە بکات لەژیانی خۆیدا، جا چ پەیوەندی بەخودی خۆیەوە هەبێت چ بەخۆی و خێزانی، چ بەخۆی و خێزانی و دەوروبەری و کۆمەڵگاکەیەوە، .. هتد.

کەواتە ئامانجی یەکەمی جەنگ و جیهاد ئەوەیە کە مسوڵمانان دین و ژین و سەرو ماڵ و ئابڕوو و کەرامەت و زەوی و نیشتمانیان پارێزراوو سەلامەت بێت، هیچ کەسێك نەتوانێ مافیان پێشێل بکات و خاکیان لێ زەوت بکات، وە ژێر چەپۆکیان بکات و بێ دەستەڵاتیان بکات.

ئەوەش وەك ئاماژەم پێی کرد هەموو خاوەن عەقڵێك و خاوەن ویژدانێك دانی پێدا دەنێن و دەیسەلمێنێ و بێ لاو جیی و دڵ لەدڵ دان دەڵێ: دەبێ هەر وا بێت.

**دووەم: ئامانجی دووەمی جیهاد ئەوەیە کە: (ڕێگا تەخت بکرێ و خۆش بکرێ بۆئەوەی کەشەریعەت و بەرنامەی خوا پیادە بکرێ و پەیامی خوا بگات بە بەندەکانی خوا).**

چونکە مادام خوا بەس بۆ خۆی ئینسانەکانی خوڵقاندوون و تەنها بۆ خۆی دەیان ژیەنێ و هەر بۆ خۆی دەیان مرێنێ و پاشان زیندویان دەکاتەوە. وە بە پێغەمبەرانی خۆیدا (علیهم الصلاة والسلام) هیدایەت و شەریعەتی خۆی بۆ ناردوون، بۆیە جێی خۆیەتی کەتەنها ئەویش بپەرستن و بەندایەتی بۆ بکەن جا جیهاد لەسەر مسوڵمانان فەرز کراوە تاکو هەموو ئەو کۆسپ و پەرچانەی کەدێنە سەر ڕێگای بەندەکانی خواو هەموو ئەو کۆسپ و پەرچانەی کەدەبنە ڕێگری ئەوە کەخەڵك لەدینی خوا حاڵی بن و حەقیقەتی دینی خوا ببینن دەبێ لابچن، تاکو ڕێی بەندایەتیکردنیان بۆ خوای پەروەردگاری خۆیانیان لێنەبەسترێ.

بۆیە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەك دەنگن کەئەگەر مسوڵمانان دەسەڵاتیان بێت دەبێ بستە خاکێکی سەرزەمین نەمێنێ و ئینسانێك لەژێر چەتری ئاسمان دا نەمێنێ کە لەگوێ بیست بوونی دەنگی زوڵاڵی دینی خوای دادگەر بێبەش بێ و پەیام و شەریعەتی خوای پێ نەگات، چۆن؟!

سەرەتا مسوڵمانان خەڵك بانگەواز دەکەن و بانگیان دەکەن بۆلای دینی خوا، جا ئەوەی وەڵامی دایەوە ئەوە مسوڵمانەو ئەوەش کەوەڵامی نەدایەوە پێی دەگوترێ: لەسەر دینی خۆت بمێنەوە بەڵام مل کەچ بکە بۆ دەسەڵاتی ئیسلام، لەسەر دین و بەرنامەی خۆت بمێنەوە چونکە خوا فەرموویەتی: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ..) (البقرة: ٢٥٦) واتە: (تۆبزی کردن و ناچارکردن لەوەرگرتنی دین دا نیە.) کە بەداخەوە گەلێك هەن کە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا بەهەڵەدا چوون بۆیە پێویستی بەڕوونکردنەوە هەیە: مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە کەئینسان وەك تاك ئازادەو مافی هەڵبژاردنی هەیە، وەك لەجێیەکی دیکەش خوا فەرموویەتی: (.. فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ..) (الكهف: ٢٩) بەڵام ئەگەر مسوڵمانان کیان و قەوارەو دەسەڵاتێکیان هەبێ و توانایەکیان هەبێ، ئایا لەو کیان و قەوارانە دەگەڕێن و لەو دەوڵەت و دەسەڵاتانە دەگەڕێن کەبەچەتد سیستەمێکی کوفر حوکم بەسەر ئینسانەکان دا دەکەن و دەیان چەوسێننەوە وە ڕێگایان لێدەگرن کەئیمان بهێنن یا نەهێنن؟!

خوا بەخوایەتی خۆی (جل جلالە) قبووڵی نەکردووە کەئایین و بەرنامەکەی بەزۆر بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێ؛ بەسەر تاکە تاکەی خەڵکدا، بەڵام پێویستە شەریعەتی خوا، دینی خوا دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوا بێ بۆئەوەی خەڵک ئەگەر ئیمانی هێنا بەئازادی ئیمان بێنێ، ئەگەر ئیمانیشی نەهێنا هەر ئازاد بێ و سەرەنجام لەو تاقیکردنەوە (إبتلاء)یەدا کە لەژیانی سەر زەوی‌دا بۆی دانراوە بەشداریی بکات، ئەمەش لەم ئایەتەدا ئەردەکەوێ کە دەفەرموێ: (وَقَـاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّيـنُ كُلُّـهُ لِلَّـهِ.. ) (الأنفال: ٣٩) واتە: (وە لەگەڵ دوژمنانتان دا بجەنگن – ئەگەر دەسەڵاتتان بوو – هەتا فیتنە نامێنێ)، (فتنە) واتە ئازار دانی مسوڵمانان، هەندێك لەزانایانیش بەشیرك و كوفریان تەفسیر كردوە، کە یانی: دەسەڵاتی شیرك و كوفر نەك خودی شیرك و كوفر، چونكە ئەگەر كابرا گوتی: باشە ئەوە من سەرانە (جزیة) دەدەم بەڵام هەر كافرم، ئیسلام ناڵێ نەخێر دەبێ كوفرەكەت هەر واز لێبهێنی، بەڵكو دەڵێ: باشە سەرانە بدەو هەر كافر بە، وەك خوا فەرموویەتی: ( قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ) (التوبة:٢٩) واتە: (لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگن کەبڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی نیە.. تاكو بەملكەچی سەرانە دەدەن).

بەڵێ هەركەسێك ملی كەچ كرد بۆ حوكم و دەسەڵاتی ئیسلام تۆبزی لێناكرێ بۆ واز لێهێنانی ئایین و بەرنامەو عەقیدەكەی جا ئەو ئایین و عەقیدەیەی هەرچی‌یەك بێ تێیدا ئازادە.

كەواتە: ئامانجی دووەمی جیهاد ئەوەیە كە ڕێگا تەخت بكرێت بۆ عەبدەكانی خوا داخوا ئیمان بەخوای خۆیان دێنن یا ناهێنن، مل بۆ دینەكەی كەچ دەكەن یا كەچ ناكەن، ئەگەر ملیان بۆ دینی خوا كەچ كرد وەك شەخسی خۆیان ئەوە باشە، ئەگەر ملیان بۆ دینی خوا كەچ نەكرد وەك شەخس، با لەسەر عەقیدەی خۆیان بمێننەوە، بەڵام بۆیان نیە دژایەتی شەریعەتی خوا بكەن بڵێن: نابێ حاكم و دەسەڵاتدار بێ، با لەسەر دینی خۆی بمێنێتەوەو سەرانەی خۆی بدات مل كەچ بكات بۆ سیستەمی ئیسلامی با عیبادەت و بەندایەتیش بۆ خوا ئەنجام نەدات و با مسوڵمانیش نەبێت.

## ٤- جیهاد چۆن دەکرێ؟!

بەکورتی دەڵێین: هەر تاعەتو عیبادەتێک لەئیسلامدا کە دەکرێت دوو مەرجی سەرەکی هەیە: یەکەم بۆ خوا بێ، دووەم: بەپێی شەرعی خوا بێ، واتە یەکەم: ئیخلاصی تێدا بێت، دووەم: شوێن کەوتنی شەرع (إتباع الشرع).

هەر کردەوەیەک یەکێک لەو دووانەی تێدا نەیەتەدی ئەو خوای پەروەردگار نایەوێ، چ بۆ خوات نەبێ، یا بەپێی شەرعی خواش بێ، خوا نایەوێ، چ بەپێی شەرعی خوا نەبێ، یا بۆ خواشت بێ، خوا هەر نایەوێ.

واتە: دەبێ بپەرسترێ، تەنیا ئەو بپەرسترێ وەتەنیا بەو شێوەیەش بپەرسترێ کەخۆی دیاری کردوە، ئەم دوو مەرجە بۆ هەموو تاعەتو عیبادەتێک هەر هەنو بەمەرج دەگیرێن، کەدیارە جیهادیش یەکێکە لەتاعەتو عیبادەتەکان.

بەڵام بۆئەوەی بزانین جیهاد چۆن دەکرێ، بەتایبەتی لەواقیعو بارودۆخو هەلومەرجی ئێستادا دەبێ ئاگامان لەو خاڵانە بێ:

یەکەم: جیهاد وەسیلەیە نەک ئامانج:

دەبێ ئێمەی مسوڵمانو ئێمەی ئیسلامی بزانین جیهاد وەسیلەیەو ئامانج نیە، بەڵێ جەنگو جیهاد وەسیلەیەکە ئیسلام لەکاتی ناچارییدا دەستی بۆ دەبات، ئیسلام ئەگەر ناچار نەکرێ دەست بۆ چەکو هێز نابات، ئەگەر خەڵک بەقسەی خۆشو بە بانگەوازو بەتێگەیاندنو بە بەڵگەو دەلیل بێتە ژێر باڵی بە بەزەیی شەرعو ئیمان بەخوای خۆیان بێنن، یاخود ئەگەر ئیمانیشی پێنەهێنن بەڵام مل بۆ سیستەم و حوکمی شەریعەتی خوا کەچ بکەن، ئیسلام لێیان دەست ناداتە چەک، بە بەڵگەی ئەوەی کە هەم لەچەندەها ئایەت دەفامرێتەوەو هەم لەسیرەی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە بەرێزەکانی، کە کاتێک سوپای ئیسلام لەگەڵ سوپای کوفردا ڕووبەڕوو بۆتەوە داوای سێ شتیان لێکردوون:[17] یەکەم: پێیان

---

[17] بۆ وێنە: ئەو فەرموودەیەی کە (مسلم) گێڕاویەتەوەو لەنامیلکەکانی پێشودا هێناومانە.

گوتوون: مسوڵمان بن، ئەگەر مسوڵمان بووبن ئەوە وەك ئەوانیان لێهاتوە، هەتا جاری وا هەبووە میللەتێك و وڵاتێك كەمسوڵمان بووە ئەگەر سەرۆك و برا گەورەكەیان مسوڵمان بووبێ هەر ئەو سەرۆك و برا گەورەیە یان كردۆتەوە بەسەرۆك و برا گەورەیان ئەگەر شایستە بووبێ[١٨].

دووەم: ئەمجار ئەگەر مسوڵمان نەبووبن، گوتوویانە: قەیدی نیە مسوڵمان مەبن، بەڵام سەرانە (جزیة) بدەن، ساڵانە ئەندازەیەك ماڵ بدەن بە دەوڵەتی ئیسلامی، چونكە ئێوە دەبن بە (رعیة)ی دەوڵەتی ئیسلامی، ماڵتان دەپارێزێ، گیان و ناموستان دەپارێزێ، ڕێزو كەرامەت و ئازادیەكانتان دەپارێزێ، پەرستگاكانتان دەپارێزێ، ناهێڵێ هیچ كەس زوڵمتان لێ بكات، سەربازیتان پێ ناكات، ناڵێ جیهاد بكەن، چونكە جیهاد عیبادەتێكە مسوڵمان دەبێ بەنیەتەوە ئەنجامی بدات، بۆیە جیهاد بەئەهلی زیممە (أهلُ الذمّة) ناكرێت مادام مسوڵمان نەبن جەنگ و جیهادیان لەسەر نیەو نابێ پێیان بكرێت، جا مادام ئیسلام ئەم هەموو خزمەتانەت دەكات تۆش دەبێ سەرانەیەكی ماڵی بدەی بەدەوڵەتی ئیسلامی، وە ئەوە نیشانەی ئەوەیشە كەتۆ دژی ئەو كیان و قەوارەو دەوڵەت و سیستەمە نیت.

سێیەم: ئەمجار ئەگەر ئەوەشیان قبووڵ نەكردبێ، ئەوجا ئیسلام بەناچاری دەستی داوەتە چەك، نەك بۆئەوەی مسوڵمانیان بكات، بەڵكو بۆئەوەی ملیان پێ كەچ بكات بۆ سیستەم و حوكمی ئیسلامی، هەركاتێك لەگەرمەی شەڕدا گوتبێتیان دەست لەدژایەتیكردن و جەنگ هەڵدەگرین و مسوڵمان دەبین، یا

---

[١٨] بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا ﷺ (المنذر بن ساوی العَبْدي) كە پادشای (بحرین) بوو پاش ئەوەی مسوڵمان بوو هەر لەشوێنی خۆیدا هێشتیەوەو نامەیەكی بەم جۆرەی بۆ نارد: (بسم الله الرحمن الرحيم، من محمد رسول الله الى المنذر بن ساوى سلامٌ على من اتبع الهدى، اما بعدُ: فاني ادعوك الى الاسلام، فاسْلِمْ تَسْلَمْ، اسْلِمْ يجعل الله لك ماتحت يديك) بڕوانە: (نصب الراية لاحاديث الهداية) للأمام الزيلعي ج٤ص٤١٩، ٤٢٠، وە بڕوانە: (الجهاد والقتال في السياسة الشرعية) د. محمد خير هيكل، ج١ص٧٩٤، ٧٩٥.

گوتبێتیان مسوڵمان نابین بەڵام سەرانە دەدەین، ئەوە یەکسەر شەڕ ڕاوەستاوەو کۆتایی پێ هاتوە، چونکە ئامانج لەجەنگ ئەوە نەبووە کەبەزۆر مسوڵمانیان بکەن، بەڵکو ئامانج ئەوە بووە کەملیان پێکەچ بکرێ بۆ دەستەڵاتی ئیسلامیی و شەریعەتی خوا، ئیدی لەماڵی خۆیان دابنیشن و لەسەر دینی خۆیان بمیننەوە، وە ئازادیش بن لەئەنجامدانی دروشمەکانی دینی خۆیان لەنێو خۆیاندا.

هەڵبەتە چەندان فەرموودەی (صحیح) ی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەیەوە هەن، جگە لەسیرەی عەمەلیی پێغەمبەر ﷺ و چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی لەجەنگەکانی کە لەگەڵ دەوڵەتی فارس و ڕۆم و میصرو کوێ و کوێدا کردوویانن.

پێغەمبەر ﷺ لەیەکێك لەفەرموودەکانیدا لەوبارەوە دەفەرموێ: (فَاذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ[19] فَادْعُهُمْ الى ثَلاثِ خِصَالٍ)[20] هەرکاتێك گەیشتیە دوژمنەکەت لەهاوبەش پەیداکەران بانگیان بکە بۆ یەکێك لەسێ شتان: بانگیان بکە بۆ ئیسلام، ئەگەر لێیان وەرگرتی ئەوە باشەو وازیان لێبهێنە، بەڵام ئەگەر مسوڵمان نەبوون، ئەوجار بانگیان بکە بۆئەوەی سەرانە بدەن، جا ئەگەر سەرانەیان دا وازیان لێبهێنە، بەڵام ئەگەر نە مسوڵمان بوون نە سەرانەیان دا، ئەمجار (فَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَقَاتِلْهُمْ) پشت بەخوا ببەستەو لەدژیان بجەنگە، بۆئەوەی ڕێگا چۆڵ بکەن، بۆئەوەی مل کەچ بکەن بۆ دەستەڵات و حوکمی ئیسلامیی و نەبنە کۆسپ و لەمپەر لەڕێی گەیاندنی پەیامی خوادا.

کەواتە: جیهادو جەنگ وەك گوتمان وەسیلەیەو ئامانج نیە، وە ئیسلام بەس لەکاتی ناچاریشدا پەنا بۆ چەك و هێز دەبات.

---

[19] کەواتە: تەنیا ئەهلی کیتاب سەرانەیان لەسەر نیە، بەڵکو غەیری ئەوانیش، وەك ڕەئیی بەهێزتر (راجح)ی زانایان لەسەر ئەوەیەو لەنامیلکەکانی پێشوودا بەوردی باسمان کردوە، بڕوانە نامیلکەی: (جیهاد لەڕێی خوادا، بۆئەوەی بەھەڵە لەجیهاد تێنەگەین و لەسەر جەنگ کردنمان قەرزدار نەبینەوە) لاپەڕە (٢١، ٢٢).

[20] رواه مسلم عن بريدة.

دووەم: جەنگ و جیهاد بەدیل جێپڕکەرەوەی ئەرکە شەرعییەکانی دیکە نیە:

جیهاد بەدیل نیە بۆ لایەنەکانی دیکەی کاری ئیسلامیی؛ بەدیل نیە بۆ بانگەواز، بەدیل نیە بۆ پەروەردەکردنی مسوڵمانان، بۆ تێگەیاندنی خەڵك، واتە کەلێن پڕکەرەوەی ئەوان نیە، بەڵکو جیهاد ئەرکێکە لەئەرکەکانی ئیسلام، وە لەکۆتایی ئەرکەکانی دیکەدا دێت، کەواتە دەبێ مسوڵمانان لەپێشدا بانگەوازیان هەبێ، فێرکردنیان هەبێ، بۆ خەڵك، تێگەیاندن و پێگەیاندنیان هەبێ، بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵکیان هەبێ، بیانووی خەڵك بڕن و (إقامة الحُجة)یان لەسەر بکەن، ئەمجار لەکات و هەل و مەرجی خۆیدا کاتی جیهاد دێت.

کەواتە: جیهاد یەکێکە لەئەرکەکان و بەدیل نیە بۆ ئەرکەکان.

سێیەم: کۆمەڵگا و کیان و قەوارەیەکی ئیسلامیی بەجیهاد بنیات ناترێ، بەڵکو بەجیهاد دەپارێزرێ:

کۆمەڵێکی ئیسلامیی بەو چەك و هێزە کەبەدەستیانەوەیە خۆیان دەپارێزن، وە دەوڵەتێکی ئیسلامیی بەچەك و بەجیهاد خۆی دەپارێزێ، ئەگەرنا دەوڵەتی ئیسلامیی و کۆمەڵگای ئیسلامیی بەتێگەیاندنی خەڵك لەدین، بەبانگەواز بەپەروەردەو فێرکردن، بەتەزکیە، بەوە کۆمەڵگای ئیسلامی بنیات دەنرێ، بە بەڵگەی ئەوە کە هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە بانگەوازەوە دەستیان پێکردوەو یەکسەر دەستیان بۆ چەك نەبردوە، خوای بێ وێنە لەسەر زمانی ژمارەیەك لەپێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) فەرموویەتی: ( يا قوم اعبدوا الله مالكم من اله غيره)[٢١]، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ سێزدە ساڵی ڕەبەق لەمەککە هەر خەریکی بانگەواز و تێگەیاندن و فێرکردن و بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵك بوو، وە کە چوو بۆ مەدینەش کیان و دەوڵەتی ئیسلامیی لەوێش هەر بە

---

[٢١] بڕوانە: سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی ژمارە (٥٩، ٦٥، ٧٣، ٨٥) کە هەرکام لە (نوح) و (هود) و (صالح) و (شعيب) ئەوەیان فەرمووە.

بانگەواز بنیات نرا بەڵام دوایی بەجیهاد دیفاعی لێکراو پارێزرا، ئەگەرنا هیچ کەس لەمەدینە بە زۆر مسوڵمان نەکرا، پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بچێتە مەدینە بانگەوازکارانی ئیسلام ئیسلامیان لەنێو شاری مەدینەدا بڵاوکردبۆوە، وە کەپێغەمبەر ﷺ چوو جاری حوکمی ئیسلامییدا لەوێدا بەبێ ئەوەی کەجارێ دڵۆپە خوێنێک برژێ.

کەواتە: با هەموومان بزانین – بەتایبەتی ئێمە کەخۆمان بەئیسلامیی و موجاهید دەزانین – کەکیان و قەوارەی ئیسلامیی بە بانگەواز و بە پەروەردەو بەفێرکردن و بە تێگەیاندنی خەڵک بنیات دەنرێ، بەڵام دوایی بەجیهادو جەنگ و هێز دەپارێزرێ و فراوان دەکرێ، وە بەهێزو پێز دەکرێ.

## چوارەم: جەنگ و جیهاد پلە پلەو قۆناغ قۆناغەو حوکمی جۆراو جۆری هەیە:

حەقیقەتێکی دیکە بۆ روونکردنەوەی چۆنیەتی جەنگ و جیهاد، کە ئایا جیهاد چۆن دەکرێ، ئەوەیە کەبزانین جیهاد پلە پلەو قۆناغ قۆناغە وەحوکمی جۆراوجۆری هەیە.

هەندێك هەر ئەوە دەزانن کەجیهاد ئەوەیە یەکسەر دەبێ دەست بدەیە چەك و تەقە بکەی! نەخێر وا نیە، بەڵکو جیهاد پلە پلەیە بەپێی توانا، تەماشا دەکەین پێغەمبەر ﷺ یەکەمین ئایەت کەبۆی هاتە خوار لەسوورەتی (الحج)دا لەبارەی جەنگ و جیهادەوە بەیەکدەنگیی هەموو توێژەرەوانی قورئان ئایەتێك بوو کەجارێ جیهادی فەرز نەکردبوو، بەڵکو تەنیا مۆڵەتی دابوو کە بکرێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾(الحج:٣٩) واتە: مۆڵەت درا بۆ کەسانێك کە ستەمیان لێ‌کراوەو جەنگیان لەگەڵ دەکرێ – کە بەرگریی لەخۆیان بکەن – وە خوا لەسەر سەرخستنیان بەتوانایە.

ئەمە یەکەمین ئایەتە کە دەربارەی جەنگ و جیهاد هاتەخوار، ئەویش فەرزی نەکردوە، بەڵکو بەس دەفەرموێ: مۆڵەت دران.

ئایەتی دووەم لەسوورەتی (البقرة) دایە دەفەرموێ: (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ... )(البقرة: ٢١٦) واتە: جەنگ كردنتان لەسەر نووسراوە هەرچەندە حەزیشی پێ ناكەن.

لەپێشدا مۆڵەتی پێدان چونكە هەر ئەوەندەیان لەتواناداا بوو كە ئەگەر كەسێك توانی‌و لەخۆیڕابینی بیكات، بەڵام جارێ واجب نەبوو بوو، دوایی بەم ئایەتەی دووەم واجب بوو، كەواجبیش بوو جیهادی بەرگریی (جهاد الدفع) واجب بوو، واتە بەرپەرچ دانەوەو بەرگری لەخۆكردن، ئەمجار دوایی قۆناغ بەقۆناغ تا وای لێهات جیهادی هێرش بردن (جهاد الطلب) یش لەسەر مسوڵمانان واجب بوو چونكە وردە وردە تواناایان زیاتر بوو.

كەواتە جۆرەكانی جیهاد وە قۆناغەكانی جیهاد بەپێی توانای مسوڵمانان دەگۆڕێت توانات زیاتر بێ موكەللەف دەبی بەجۆرێكی قورستری جیهاد، توانات كەمتر بێ بەجۆرێكی سوكتری جیهاد، ئەگەر هیچ تواناشت نەبێ هەر موكەللەف نی‌و جارێ لەسەرت پێویست نەبووە، چونكە: (لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا..)(البقرة: ٢٨٦)

## پێنجەم: بەبێ شارەزایی لەقورئان‌و سوننەت‌و ئاشنایی بەواقیع جیهاد ناكرێ:

بەبێ شارەزایی لەقورئان‌و سوننەت، وە بەبێ شارەزایی ورد لەسیرەی پێغەمبەر ﷺ ، وە بەبێ هەل‌ومەرج ناسین‌و واقیع بینی تەواو جیهادمان بۆ ناكرێ‌و ناتوانین بڕیارێكی سەر ڕاستانەو شەرعی‌یانە دەربارەی جیهاد بدەین، دەربارەی ئەو جۆرە جیهادەی كەپێی هەڵدەستین، بەڵكو دەبێ جوان جوان لەئایەتەكانی قورئان ڕابمێنین‌و لێیان شارەزا بین، وە لەفەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ وە لەسیرەو ژیانی پێغەمبەر و قۆناغەكانی جیهاد وردبینەوەو سەرنج بدەین داخوا حیكمەتی چی‌یەو بۆچی ئایەتی یەكەم[٢٢] دەفەرموێ: (أذن للذين يقاتلون بأنهم ظلموا)، وە بۆچی ئایەتی كۆتایی دەفەرموێ: (.. وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً..)(التوبة: ٣٦)؟! واتە: وە لەگەڵ تێكڕای هاوبەش بۆ خوا دانەران دا بجەنگن.

---

[٢٢] واتە: ئایەتی یەكەم كەلەبارەی جەنگ كردنەوە هاتۆتە خوارێ.

چونکە سەرەتا تواناو بڕستیان کەم بووەو هەر ئەوەندەیان پێکراوەو دوایی کەتواناو ئامادەیی پتریان بووە زیاتریان پێ کراوە، تۆ کەجەنگ و جیهاد دەکەی دەبێ بزانی لەچ قۆناغێك دای و کام پلەی جیهاد ڕوو لەتۆ دەکات؟ کامەیانت بۆ ئەنجام دەدرێت؟ توانات چەندە؟ هەل و مەرجت چۆنە؟ ئایا کۆمەڵگایەکەت چی پێویست دەکات؟! کەبێگومان دەبێ چی پێویستە ئەوەی لەگەڵدا بکەی نەك خۆت چیت پێ خۆشە، بەڵکو کۆمەڵگاو میللەتەکەت چۆنی پێویستە، ئایا بانگەوازت چاك لەگەڵدا کردووە؟! چاك حەڵاڵ و حەرامت لێ حاڵی کردوە؟ چاك و ڕاست لەڕاستی یەکانی ئیسلام (حقائق الأسلام)ت ئاشنا کردوە؟!

ئایا قاعیدەی جەماوەرییت دروست کردوەو کارێکی وات کردوە کەبگونجێ خەڵکێك هەبێ کیان و قەوارەی حوکمێکی ئیسلامیی لەسەرشانی بنیات بنرێ؟! کیان و قەوارەیەکی ئیسلامیی ئەوتۆ کەناوی ئیسلامی لێ خەسار نەبێ و شایستەو پڕ بەپێستی بێت؟!

ئایا ئەو ئەرکانەت ئەنجام داون و خەڵکێکی ئاوا ڕەخساوە؟! ئایا پێغەمبەر ﷺ بۆچی لەشاری (مەککە) چاڕێ حوکمی ئیسلامیی نادات بەڵام بۆ لەشاری (مەدینە) دەیدات؟! چونکە لە (مەککە) بەڵێ مسوڵمانی لێن بەڵام قاعیدەی جەماوەری دروست نەبووەو خەڵك هێندە نیە بایی ئەوە بن و بەشی ئەوە بکەن، کە قەوارەو کیانێکی ئیسلامیی لە سەر شانیان بنیات بنرێ، بەڵام لە (مەدینە) هەیەو ئەو زەمینەیە ڕەخساوە بۆیە ئەو چارە پیرۆزە دراوە.

**شەشەم: خودی جەنگ و جیهادکردنەکەش نابێ لەشێوازەی شەرع بچێتە دەرێ:**

جەنگ و جیهاد یاخود هەر شتێکی دیکە کەمسوڵمان پێی هەڵدەستێت دەبێ لەسنووری شەرع دا بێت، وە دەبێ لەشێوازەی شەرع نەچێتە دەر، چونکە ئێمە وەك مسوڵمان، وەك ئیسلامیی بڕوامان بە (میکاڤیللی یەت)[22] نییە کە دەڵێ:

---

[22] میکاڤیل ناوی دانەری کتێبی (ئەمیر)ە کەپێی وایە حوکمڕان بۆی هەیە هەر وەسیلەیەك بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی بەکاربهێنێ هەرچەندە نزم و پەستیش بێ!.

(الغايَةُ تُبَرِرُ الوَسيلَةَ) واته: ئەگەر ئامانجت باش بوو وەسیلەت ناشەرعیش بێ قەیدی نیە، نەخێر، ئیسلام دەڵێ: وەك چۆن ئامانجەكەت شەرعی یە دەبێ وەسیلەكەشت شەرعی بێ، چونكە بەوەسائیلی ناشەرعی ئامانجی شەرعی نایەتەدی، یەكێك لەوانە ئیسلام لەكاتی گەرمەی جەنگیش دا ڕێگا نادات كە مسوڵمانان ئافرەتان بكوژن مادام بەشداری شەڕ نەبن، یان منداڵ و پیرو ئەوانەی گۆشەنشین (راهب) ن بكوژن، یان كرێكارێكو كارمەندێك یان كەسێكی لاشەڕ بكوژن، لەگەرمەی جەنگیش دا نەهی كراوە كە ئەوانە بكوژرێن، لەسەر ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان، جا هەندێك لەوجۆرە كەسانە بۆ وێنە:[٢٤] ئافرەتو منداڵ دەق (نص) ی شەرعی یان لەسەر هەیەو هەندێكیش بە (قیاس) و هەندێكیش زانایان لەسەریان یەك دەنگن كەنابێ بكوژرێن یان ئازار بدرێن.

ج جای لەكاتی غەیری جەنگدا!! كەواتە ئەوانەی هەر بەناحەق ئیرهاب (ارهاب) پاڵ دەدەنە لای مسوڵمانان، بە داركەری شەوێ (حاطب الليل) و تفەنگ بەتاریكی یەوە ئەرو بێ ویژدان دادەنرێن و قسەیەكی بۆش و دەعوایەكی بێ بەڵگە دەكەن.

چونكە وشەی (إرهاب) لە فەرهەنگەكانی زمانی سەردەمدا ئاوا پێناسە كراوە دەڵێ: كوشتنی خەڵكە بەشێوەیەكی هەرەمەكیی، وەك دەڵێ: (شەلم كوێرم كەس نابوێرم)، ئەوە ئیرهابە، ئەو ئیرهابەی كە مەرفووز (مرفوض) ە، كەبێگومان ئەوە لەڕووی شەرعیشەوە مەرفووزە، بەڵام ئەگەر تۆ دوژمنی خوا بترسێنی، یا دوژمنی خۆت بترسێنی، ئەوە شتێكی مەشروعو ڕەوایەو هەموو كەسیش ئەوە بۆ خۆی بەڕەوا دەزانێ.

---

[٢٤] وەك لە (صحيح البخاري) دا هاتووە، هەروەها بڕوانە: (الأم)ی ئیمام شافعی ج٤ص٢٣٩، ٢٤٠، كە گوتوویەتی: (ولايجوز لأحد من المسلمين ان يَعْمِدَ قَتْلَ النساءِ والولدان إن رسول الله ﷺ نهى عن قتلهم.. وانهم ليسوا ممّن يُقاتِلُ .. ويترك قتل الرهبان وسواء رهبان الصوامع ورهبان الديارات والصحاري وكل من يحبسُ نفسَهُ بالترهبِ تركْنا قتلَهُ إتباعاً لأبي بكرٍ رضي الله عنه).

وە بڕوانە: (مشارع الأشواق الى مصارع العشاق) ج١ص٢٥، ٢٦.

ئەمەریكا ئێستاش نازانێ تەقینەوەكانی (٢٠٠١/٩/١١) كێ كردوویەتی و تائێستاش لەوبارەیەوە بەڵگەیەكی نەخستۆتەڕوو[٢٥]، بەڵام ئەمەریكا بەحەقی خۆی دەزانێ و بۆ خۆی بەڕەوای دەزانێ كە هەموو خەڵكی دنیا بترسێنێ و هەڕەشە لەهەموو خەڵك بكات.

ئێمەش دەڵێین: ئەگەر ئەمەریكا پێشتر دەستی بەزوڵم سوور نەبووایەو ئەوەی بەسەری هاتووە كاردانەوەی (رد فعل)ی ستەم و خراپەی زۆرو جۆراوجۆری نەبووایە لەڕاستییدا هەقی خۆی بوو، چونكە هەركەسێك كە دەچێ خەڵك قەتڵ و عام دەكا حەقی خۆیەتی تۆڵەی لێبكرێتەوە، بەڵام تۆ بڵێی ئەوە كاردانەوەی زوڵمێك نەبێ كەپێشتر كردوویەتی؟! وەڵامی زوڵمێك نەبێ كەپێشتر كردوویەتی؟! وە بەرهەمی تۆوێك نەبێ كەبۆ خۆی وەشاندوویەتی؟! ئاخر نابێ بە بەڵگە دیار بێ كە دوژمنەكەت و تەرەفی بەرانبەرت كێیە؟، تۆ یەكسەر هەڕەشە لەوەهمێك بكەی یان لەخۆوە لەخەڵكێك هەڵپیێچی، ئا ئەوە ئیرهابە!!

جا لەشەریعەتی خوادا ڕێگا بە مسوڵمان نادرێ كە بەبیانووی جیهادو جەنگەوە بڵێ: (شەلم كوێرم كەس نابوێرم)، بەڵكو دەبێ جیهادو جەنگ و كوشتارەكەش وەك چۆن لەپێناوی خوادایە دەبێ بەپێی شەرعی خواش بێ، وە بەئادابی شەرعیشەوە بێ، وە پێویستە سەرجەم حوكمە شەرعییەكانی تێدا ڕەچاو بكرێن، ئەوجار جەنگ و جیهادەكە بەعیبادەت لەقەڵەم دەدرێ و لەڕوانگەی شەرعەوە ڕێی پێدەدرێ و خاوەنەكەیشی پاداشتی لەسەر وەردەگرێ، ئەگەرنا لەجیاتی پاداشت لەسەریشی سزا دەدرێ!!

---

[٢٥] ئەم وتارە لەرۆژی (٢٠٠١/١٠/١٩) دراوە، كە ئەوكاتە ئەمەریكا نیمچە بەڵگەو نیشانەیەكیشی بۆ ئیسپاتی دەعوایەكی نەخستبووە ڕوو.

### حەوتەم: بەبێ هەبوونی قیادەیەکی شارەزاو سەر ڕاست دروست نیە بەناوی جەنگ و جیهادەوە دەست بۆ چەك و هێز ببرێ:

یەکی دیکە لەو خاڵانەی کەچۆنیەتی و میکانیزمی ئەنجام دانی جەنگ و جیهاد لەئیسلام دا ڕوون دەکەنەوە، ئەوەیە کەئەنجام دانی ئەو ئەرکە گەورەو فەرزە گرنگە بەر لەهەر شتێك پەکی لەسەر قیادەیەکی سەر ڕاست و شارەزا کەوتوەو بەبێ ڕەخسانی ئەو مەرجە دروست نیە دەستی بۆ ببرێ، چونکە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە جەنگ و جیهادکردن هەر وا شتێکی سیناو سادە نیەو دووربینی و وردبینی زۆری پێویستە، ئەگەرنا مسۆگەر پەشێمانیی و قەرزدار بوونەوەی بەدوادا دێت[٢٦]!

دیارە پێشتریش باسمان کرد کەجیهاد بەبێ شارەزایی تەواو لەقورئان و سوننەت و سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئاشنایی چاك بەو واقیع و هەل و مەرجە کەتێیدا ئەنجام دەدرێ، ناکرێ و ئاشکراشە کەئەو شارەزایی و بەرچاوڕوونیی و واقیع بینی‌یە مەگەر چۆن دەنا بۆ غەیری قیادەو برا گەورە مەیسەر نابێت،

ئاشکراشە کەمەبەستمان لەشارەزایی بەقورئان و سوننەت تەنها لەبەرکردن (حِفظ)ی دەقەکانی قورئان و سوننەت نیە، هەروەها مەبەستیشمان لەئاشنایی بەواقیع و هەل‌ومەرجی وڵات تەنها گوێ گرتن لەهەواڵ و دەنگ و باسەکانی دنیا نیە!

ئنجا بێگومان خوای کاربەجێ کەفەرموویەتی: (يا أيها الذين آمنوا أطيعُوا اللّهَ وَأطيعُوا الرَّسُولَ وأولِي الأمر منكم..) (النساء: ٥٩) ، مەبەست پێی سەرجەم حاڵەتەکانی مسوڵمانانە چ ئاشتی چ جەنگ، بگرە بۆ حاڵەتی جەنگ ئەو فەرمانبەریی و پابەندیی‌یەی مسوڵمانان بەئەمرو نەهی و ئاراستەکردنی قیادەوە لەحاڵەتی ئاشتی و ئاسایی پێویست تریشە!

---

[٢٦] وەك بەداخەوە لەچەند شوێنێك دا ئەرجۆرە جەنگانە ئەنجام دراون و سەرەنجامیش پەشیمانیی جەنگاوەرەکان و، باج (ضريبة) دانی سەرجەم مسوڵمانانی بەدوادا هاتووە عوزری: (وەڵڵا نەمانزانی)یش هەمیشە حازرە!!

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەقیادەو چاوساغی ڕێنمایی کەری جیهادو موجاهیدان بەهیچ ڕەنگێك ناگونجێ لەدەرەوەی جوگرافیای بازنەی ئەو واقیعو مەیدانە بێت کەجەنگو جیهادەکەی تێدا جێبەجێدەکرێ، چونکە مادام (الفتوی تختلف زماناً ومکاناً وشخصاً)، وە ئەو کەسەی کە لەدەرەوەی واقیعەکەوەو بەنامەو فاکسو تەلەفۆن (توجیهات) دەنێرێو ڕێڕوونی دەکات، ناچارە پەنا بەرێتە بەر ئەمو ئەو تاکو زانیاری لەبارەی ئەو واقیعو مەیدانەوە پێ بدەن، ئەویش وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَيْسَ الخَبَرُ كالمعاينةِ)[٢٧] واتە: هەواڵ پێدران وەك دیتنێ نیە.

یان ناچارە پەنا بەرێتە بەر قیاسو گومانو خەیاڵی خۆی کە بەتەئکید لەو حاڵەتانەش دا گیرۆدەی هەڵەو پەڵە دەبێتو زۆرجار بەسەهوو و دەچێ، دیارە هەرکاتێکیش ئینسان لەتێگەیشتنو ناسینی شتێك دا بەهەڵەدا چوو لەحوکمو بڕیار بۆ دەرکردنیشی‌دا هەروا دەبێت، چونکە گوتراوە: (الحكم على شيءٍ فَرْعٌ عَنْ تصورِهِ).

ئنجا بەڕاستیی من سەرم سووڕدەمێنێ لەعەقڵو ویژدانو وەرەعو تەقوای کەسانێك کەخۆیان پێ لەنەزانینی خۆیان دەنێن لەڕووی شارەزایی شەرعی‌یەوە، کەچی ئیعلانی جەنگو جیهاد دەکەنو کە بۆ وەڵام دانەوەی هەندێك پرسیاریش سەبارەت بەڕاستو دروستییو شەرعیی بوونی کارەکەیان سەغڵەت کران، وەك (عوزر لەقەباحەت خراپتر) پاساوی کارەکەیان بەوە دەدەنەوە کەفڵانو فیسار بەتەلەفۆنو فاکس ئەو فەتواو بڕیارەیان بۆ داون!!

هەروەها جێگای سەرسووڕماتریش لەوان ئەو کەسانەن کە نازانم چۆن شەرعو عەقڵ ڕێیان دەدات (لەنەدیتە) حوکمو بڕیارو فەتوا بدەن!!

مەگەر خوێنی مسوڵمانان هێندە شتێکی کەم نەمیەتە کەناوا بەسووكو سادەیی لەسەر بناغەی جەهلو بێئاگایی بیکەینە کاسەوە؟!!

---

[٢٧] رواه أحمد والطبراني وابن حبان والحاكم عن ابن عباس رضي الله عنهما، بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الالباس عمّا اشتهر من الاحاديث على ألسنة الناس) للعَجْلوني، ج٢ص٢١٨، ٢١٩.

بەهەرحاڵ ئەم حەوت خاڵە پێویستە باش ڕەچاوبکرێن و سەرنج بدرێن بۆ زانینی چۆنیەتی و میکانیزم و شێوازی جیهاد کردن، ئەگەر بمانەوێ کە لەجیاتی قازانج و سوود زیان و زەرەر بەئیسلام و مسوڵمانان نەگەیەنین و، خۆیشمان لەجیاتی ئەجرو پاداشتی خوای دادگەرو کاربەجێ دووچاری سزاو تۆڵەی نەبین!

هەڵبەتە هەر بۆیەشە کەشەرعزانانمان خوا پاداشتیان بداتەوە لەکتێب و سەرچاوە شەرعییەکان دا بەڕاشکاوی گوتوویانە: کەجەنگ و جیهادیش وەك گەلێك مەسەلەو بابەتی دیکە پێنج حوکمە شەرعییەکانی بەسەردا دەچەسپێ کەبریتین لە:[٢٨] (الوجوب (العيني أو الكفائي)، النَّدب، الكراهة، الحرمة، الأباحة)! وە گوتوویانە کە مەرج نیە هەر شەڕو هەرایەکی مسوڵمانان لەگەڵ ئەهلی کوفردا بەجەنگ و جیهاد لەقەڵەم بدرێ، بەڵکو دەبێ سەرجەم مەرجە شەرعیەکانی تێدا بێنەدی ئەوجار پێناسەی: (الجهاد في سبيل الله) دەیگرێتەوە، ئەگەرنا بەگوێرەی نێوەڕۆك و بەرهەم و شوێنەوارەکانی حوکمەکەی دەگۆڕێ و، ئەگەر لەجیاتی قازانج زیان بەئیسلام و مسوڵمانان بگەیەنێ، ئەوە نەك هەر فەرزو سوننەت نیە، بگرە حەرامیشە[٢٩]!! پێشینانیشمان جوانیان گوتوە: (نە هەموو خوڕڕیەك ئاوەو نەهەموو چنراوێك جاوە).

بەڵێ بەڕاستیی شتێکی زۆر بێ جێ و دوور لەشەرع و عەقڵیشە کەهەرکات کۆمەڵە گەنجێکی بەحەماسەت دڵیان گەرم بوو بەبێ قیادەو بێ شارەزایی و سەر ڕاستیی هەر لەخۆوە جاڕی جەنگ و جیهاد بدەن و لاف و ئیدیعای زل زل بکەن و گوێ بەئامۆژگاری هیچ کەس نەدەن، پاشان کە لەمەیدانی واقیع و کردەیی دا سەریان وەبەردی ئەلحەدێ کەوت و هەڵەو پەڵەی خۆیانیان بۆ دەرکەوت، هەموو

---

[٢٨] واجب (پێویست) ئەوەیە کە لەکردنیدا پاداشت و لەچواندنیدا سزا هەیە، نَدب (سوننەت)یش لەکردنیدا پاداشت هەیە، بەڵام لەنەکردنیدا سزاو تۆڵە نیە، مكروە (ناپەسەند)یش لەگەڵ سوننەت دا پێچەوانەیەو، حرام (قەدەغە)ش لەگەڵ فەرزدا پێچەوانەی یەکن و، مباح (ڕەوا)یش کردن و نەکردنی وەك یەکن بۆ سزاو پاداشت.

[٢٩] بڕوانە: (الجهاد والقتال في السياسة الشرعية) ج٢ص٩٢٧ تا ٩٤٩ د. محمد خير هيكل، (المبحث السادس: هل يكونُ الجهادُ حراماً؟!).

عوزرو پاساوەکەیان ئەوەبێ کەبڵێن: ئەما زانی!! ئاخر براله مادام نازانی ئەی چۆن چۆنی و بەچ شەرع و عەقڵێك لەسەر بناغەی نەزانیی دەستت داوەتە کارێکی هێندە گەورەو خەتەری وەك جەنگ و جیهاد؟!

مەگەر خوا نەیفەرمووە: (وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ..)(الاسراء: ٣٦) واتە: بەدوای شتێك مەکەوە کەزانیاریت لەبارەیەوە نیە؟!

ئنجا ئایا ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مردنی ئینسانێك کەبەهەڵە فەتوای بۆدراوەو سەرەنجام مردوە، بەو کەسانەی فەرمووبێ کەفەتوای هەڵەیان داوە: (قتلوهُ قتلهم الله! ألا سالوا إذ لَمْ يَعلَموا فانما شِفاءُ العيِّ السُّؤال)[٣٠] واتە: کوشتیان خوا بیانکوژێ، مادام نەیاندەزانی بۆچی نەیاندەپرسی؟! چونکە چارەسەری نەزانین هەر پرسیار کردنە!!

بەڵێ ئایا ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بەهەڵە فەتوادان و لەدەست دانی ئینسانێك بەهۆی فەتوایەکی هەڵەو نەزانانەوە هێندە تووڕە بێت و تووڕە و دووعای وا بکات، دەبێ لەبەرانبەر فەتواو بڕیارێکی ناشەرعیی و نەزانانەی وادا کەببێتە مایەی هەڵگیرسانی شەڕو گێچەڵێك کەچەندان مسوڵمانی تێدا بکوژرێن و لەدەست بدرێن بێ ئەوەی هیچ ئامانجێك بۆ ئیسلام و مسوڵمانان تەحقیق بکرێ! چەند تووڕە بێت و چ بفەرموێ؟!!

خوایە بەکەرەمی خۆت لەنەزانیی بمانپارێزەو، لەوەش خراپتر لەکارو ڕەفتاری نەزانانەو نەشارەزایانە بمانپارێزە،

ئامــــــین.

---

[٣٠] رواه أبوداود عن جابر وكذا رواه البيهقي والدارقطني، بڕوانە: (المجموع) للنووي ج٢ص٢٤١.

تێ بینی: پێغەمبەر ﷺ لەحاڵێك دا ئەو فەرمایشتەی فەرمووە کەبیستوویەتی ژمارەیەك لەهاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ لەسەفەرێك دا یەکێکیان بەردێك بەر سەری دەکەوێت و سەری دەشکێ پاشان (احتلام)ی دەبێت و پرس بەهاوەڵەکانی دەکات کەئایا ڕێی هەیە خۆی نەشۆرێ و تەیەممووم بکات؟! ئەوانیش چونکە شارەزا نەبوون گوتوویانە: نەخێر هەردەبێ خۆت بشۆی! دیارە ئەویش لەئەنجامی خۆشۆردنەکەیدا دەمرێ، جا کە دەگەڕێنەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر هاتەکە دەبیستێ ئەو فەرمایشتە دەفەرموێ.

ئەمجار من وەك لەسەرەتای قسەكانم دا بەڵێنم دا چەند قسەیەك: چەند ئامۆژگاری‌یەكی دڵسۆزانە ئاڕاستەی لایەنە سیاسی‌یەكانی كوردستان و حیزبە عەلمانی‌یەكان دەكەم بەگشتی و بەتایبەت حوكمڕان و كاربەدەستەكانیان:

یەكەم: با شەڕی دەوەن بەئاش پێكەوە نەكەین!

بەڕاستی واقیعی ئەمڕۆی كوردستان، وە واقیعی ئەمڕۆی دنیا زۆر پێویستی بەلێزانی و بەكارامەیی و وەستایی هەیە، بەتایبەتی ئێمە وەك میللەتی كورد، من كوردستانم وەك كەشتی‌یەك دێتە پێش چاو كە لەنێو دەریایەكی پڕ شەپۆلاوی‌دا گەردەلوول و گێژەڵووكەی دەریا هەڵیكردوە ئەو كەشتی‌یە تلاوتل دەكات هەر جارەی بەلایەكداو خەریكە لەكت و پڕێكدا نغرۆ بێ!

ئێمە ئەگەر خۆمان بەدڵسۆزی میللەتەكەمان دەزانین چ ئەوەی خۆی بەئیسلامیی دەزانێت كەدیارە بابایەكی ئیسلامیی دڵسۆزی بۆ میللەتەكەی دڵسۆزی بۆ خاك و نیشتمانەكەی كە میللەتەكەی بە بەشێك لەئوممەتی پێغەمبەر ﷺ دەزانێ، نیشتمانەكەیشی بە بەشێك لەنیشتمانی ئیسلامی دەزانێ، بەڵێ بابایەكی ئیسلامیی وەك تاعەت و عیبادەتێك بۆ خوا دیفاع لەمیللەت و لەنیشتمانی خۆی دەكات، چونكە بەمیراتی پێغەمبەری دەزانێ ﷺ، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتوەو ئوممەتەكەی ئەمانەتێكە لە ئەستۆماندایە، نیشتمانی ئیسلامیی ئەمانەتێكە لەئەستۆی مسوڵماناندایە، ئێمە وەك تاعەت و عیبادەتێك دیفاع لەمیللەتی خۆمان دەكەین وە دیفاع لەنیشتمانی خۆمان دەكەین، وڵاتپارێزیی و خۆپارێزیی هەردووكیان دوو جۆرە تاعەت و عیبادەتن، وڵاتپارێزیی لەدوژمنان و خۆپارێزیی لەگوناحان.

هەروەهاش هەر كەسێك بەهەر پاڵنەرو هەر هاندەرێك، خزمەتی خەڵك و وڵاتی دەكات بابیكات ئێمە وەك ئیسلامیی كوردایەتی ئەگەر بریتی بێ لەخزمەتی خەڵكی مسوڵمانی كورد بە بەشێك لەمسوڵمانەتی خۆمانی دەزانین، نەك لەڕووی

دەمارگیریی (العصبیة) و ڕەگەزپەرستی (العنصریة)یەوە، بەڵکو لەو ڕووەوە کەمیللەتی ئێمە میللەتێکی مسوڵمانە، نیشتمانەکەمان پارچەیەکە لەنیشتمانی ئیسلامیی، کاتی خۆی بەخوێنی هاوەڵان (اصحاب)ی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ ئازاد کراوەو لەژێر چەکمەی ڕەشی ئیمپراتۆری فارس و ڕۆم هێنراوەتەدەر وە ئاڵای ئازادیی ئیسلامی لەسەر هەڵکراوە، ئاخر ئەم میللەتە پێش ئەوەی ئیسلام بێ کۆیلەو ژێر چەپۆك بووە یان هی ڕۆمەکان یان هی فارسەکان.

کەواتە: با ئێمە هەموو لایەك ئەوەی کەخۆی بەئیسلامیی دەزانێ و ئەوەی کەخۆی بەهەر شتێکی دیکە دەزانێ، ئەگەر دڵسۆزین بۆ خەڵك و میللەتەکەمان و بۆ نیشتمانەکەمان با (شەڕی دەوەن بەئاش) بەیەکتر نەگێڕین[٣١].

ئێمە وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی/ الجماعة الاسلامیة) ڕامانگەیاندوەو بەئاشکرا گوتوومانە کەئێمە لەهەلومەرج و واقیعی ئێستای کوردستاندا پێشتریش هەر گوتوومانە - بەڕەوای نازانین بەهیچ ڕەنگێك کێشەو ئاشووب و ئاژاوە لەکوردستان دا بەرپا بکەین[٣٢].

تەنیا لە دوو حاڵدا بەحەقی خۆمانی دەزانین دەست بۆ چەك بەرین[٣٣]، چەکمان پێیەو چەك پێ بوونیش بەعیبادەت دەزانین پێغەمبەرمان ﷺ چەکی پێ بووە هاوەڵانی بەڕێزی چەکیان پێ بووە، میللەتەکەمان زۆر ستەم دیدەیە

---

[٣١] (شەڕی دەوەن بەئاش) لەوەوە هاتوە کە جارێکیان دوو کەس پێکەوە بۆ باراش لەئاش کردن بەڕێ دەکەون و، لەڕێگا لەسەر ئەوە دەبێتە مشتومڕیان داخوا کامیان پێشتر باراشەکەی لەئاش دەکات!، سەرەنجام دەگەنە (دەوەن)ێك و هەردووکیان لەسەر ئەوە ڕێك دەکەون کە گریمان ئەو (دەوەن)ە ئاشە بزانین کاممان زووتر باراشەکەمان لێ‌دەکەین! ئیدی هەر کامێکیان پێشبڕکە دەکات لەزووتر ڕژاندنە نێو دەوەنی باراشەکەیان و دواتر یەکتر دەدەنە بەرخەنجەران و هەردووکیان یەکدی سارد دەکەنەوە!!.

[٣٢] هەڵبەتە لەهیچ هەلومەرجێکی دیکەش دا ئەوە هەر شەرعیی و ڕەوا نیە بەلام لەوکاتەدا قسەکەم وا هاتوە.

[٣٣] کە بێگومان لەوکاتەش دا پەنا بۆ چەك بردنی خۆمان بەئاشووب و ئاژاوە نازانین بەڵکو بەجەنگێکی ڕەوار شەرعیی و جیهادێکی موبارەکی دەزانین.

پێویستی بەچەك و هێز هەیە بۆئەوەی دیفاع لەبوونی خۆی بکات، ئێمەش بەشێکین لەم میللەتە، بەڵام ئێمە لەدوو حاڵدا بەحەقی خۆمانی دەزانین کەدەست بۆ چەك بەرین:

یەکەم: کە دەست درێژیی بکرێتە سەر دینمان.

دووەم: کە دەست درێژیی بکرێتە سەر ژینمان.

چونکە قورئان وامان پێ دەفەرموێ: (لاينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم ان تبروهم وتقسطوا اليهم ان الله يحب المقسطين) (الممتحنة: ٨)

واتە: خوای پەروەردگار لێتان قەدەغە ناکات کەچاکەو دادگەریی بکەن لەگەڵ کەسانێکدا کەلەسەر دینداریی‌تان لەگەڵتان ناجەنگن و دژی دینتان نین، وە لەنیشتمانی خۆتان وەدەرتان نانێن.

بەڵێ هەرکەسێك تەماعی لەدینماندا نیە، کەبێت ڕێگای دینداریی‌مان لێ بگرێ ئەوە یەك، وە تەماعیشی لەوەدا نیە کەژینمان لێ تاڵ بکات و دەربەدەرو ئاوارەمان بکات، ئەوە ئێمە دینی خوا ڕێگای داوین بەڵکو لەسەری پێویست کردووین کەچاکەی لەگەڵ بکەین و چاکەی لەگەڵ بڵێین، وەدەستباری لەگەڵ بگرین بۆ هەر ئامانجێکی هاوبەش.

ئێمە وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی) وە وەك ئیسلامیی‌یەکانیش بەگشتی دەزانین کە کوردستان ئێستا بەتەنیا بەئێمە ناپارێزرێ و ئێستا بەتەنیا بەئێمە بەڕێوەناچێ، مادام وایە هەرکەسێك دێ با بێت دەستبارمان لەگەڵ بگرێ بۆ پاراستن و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان بۆ بەرەو پێشبردنی ژیانی گەلی مسوڵمانی کورد، بۆ هەر کارێکی خێر کە لەشەرع دا جێی دەبێتەوە.

کەواتە: با کەس موزایەدەی ئەوەمان بەسەرەوە نەکات کەئیسلامی‌یەکان ئاژاوە دەگێڕن و ئاشووبچین لەبەرئەوەی کەچوار مسوڵمان هەڵەیەك دەکەن ئیجتیهادو مومارەسەیەکی هەڵە دەکەن، ئێمە قبوول ناکەین کەتەڕو وشك پێکەوە بسووتێنرێ، ئێمە قبوول ناکەین کەشتێك ئێمە خۆمان بەهەڵەمان زانیوەو بەناتەواوی دەزانین و بەئیجتیهادێکی هەڵەی دەزانین قبوول ناکەین کە لەسەر ئێمە ماڵ بکرێ و لەپەنای ئەودا ئێمەش تۆمەتبار بکرێین، بێگومان ئەوە شتێکی ناڕەواو بێ ویژدانانەیە.

## دووەم: کوردستان مسوڵمانستانە، نەك کافرستان!

پاشان ئێمە وەك ئیسلامیی هێندە سادەو بێ ئاگا نین کەنەزانین هەردوو ئیدارەکەی هەولێرو سلێمانی دوو حکوومەتی ئیسلامیی نین، وە چاوەڕوانی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی دوو حکوومەتی ئیسلامیشیان لێناکەین، ئێمە دەزانین کە دوو کیانو قەوارەی عەلمانین، ئەوە ڕاستییو حەقیقەتێکەو لەئارادایەو پێویستە وەك خۆی دەرك بکرێ.

بەڵام بەڕاستیی کەئێمە چاوەڕوانی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی دوو حکوومەتی ئیسلامی لەو برادەرانە ناکەین، چاوەڕوانی ئەوەشیان لێناکەین کەئەوانیش ڕێگای دینداریی و مسوڵمانەتی لەئێمەو مانان بگرن، چونکە بڕیاریشمان نەداوە کوردستان ببێتە کافرستان، بڕیار وایە و هەموو کەس دەڵێ کوردستان مسوڵمانە، ئەگەر کوردستان مسوڵمانەو گەلی کورد مسوڵمانە نابێ دینداریی قاچاغ بێت، چۆن دەبێ دەرگای مزگەوتەکان دابخرێو دەرگای (بار)ەکان بکرێتەوە؟! چۆن دەبێ خەڵك بچێتە مزگەوت فێری دینداریی و تاعەتو عیبادەتو تەقواو ڕەوشتی بەرز بێ قاچاغ بێ لێی؟! بەڵام بچێتە بارو مەیخانەکان سەرخۆش و بێهۆش بێ بۆی ڕەوا بێ؟! ئەوە کەی خزمەتە بەکوردایەتی؟! ئەوە جگە لەوەی کەشەرعی خوا ڕەفزی دەکات مەنتیقی کوردایەتیو نیشتمان پەروەرێتیش ڕەفزی دەکات، مەگەر کەسانێك کە لەئاست حەقیقەت دا خۆیان گێل بکەنو چاویان بنووقێنن!!

ئێمە چاوەڕوانیمان نیە کابرا کەوەك بەرنامەی ژیان بڕوای بەئیسلام نیەو نەیکردوە بەسیستەمی حکوومەتەکەی، بێت شەریعەتی ئیسلامیمان بۆ جێبەجێ بکات!!

بەڵام بەڕاستیی ئەوەشیان لێ قبووڵ ناکەین کەڕێگای دینداریی‌مان لێبگرن، چونکە کوردستان کوردستانێکی مسوڵمانە، کوردستان بڕیار نەبووە کافرستان بێ و دینی تێدا قاچاغ بێ، بەڵام غەیری دینی خوای تێدا ئازادبێ!!

## سێیەم: هەموومان لەم وڵاتەدا بەشدارین و [illegible] لەیەكدی پاوان نەكەین!

بەڕاستیی ئێمە كوردستان بەموڵكی هەموو لایەك دەزانین، وە ئەم قەوارەو هەلومەرجە كەڕەخساوەو سازاوە لەگەڵ تێبینی‌مان لەسەری، لەسەر سیستەمی حوكمی لەسەر هەڵس‌وكەوتی، بەهی هەموو لایەكی دەزانین بۆچی؟ چونكە كاتی خۆی لەبەهاری (١٩٩١)دا گەلی كوردی مسوڵمان ڕاپەڕی‌و ڕژێمی بەعسی ڕاونا، ئەوە تەنیا برادەرانی (پارتی) نەبوون، وە تەنیا برادەرانی (یەكێتی) نەبوون، وەتەنیا (بزووتنەوەی ئیسلامی)ش نەبوو، بەڵكو بەهەموو لامان، وە بەڵكو لەپێش ئێمەدا خەڵكی مسوڵمان وەك جەماوەر ڕاپەڕی‌و بەعسی ڕاونا.

كەواتە: گەلی كورد هەمووی خاوەنی ئەم واقیعەیەو خاوەنی ئەم وەزعەیە و هیچ كەس نابێ بۆ خۆی پاوانی بكات‌و خەڵكی دیكەی لێ بێبەش (محروم) بكات.

ئەمجار ئێمە كەخۆمان بەشەریك‌و برابەش دەزانین لەم وەزعەدا خۆمان بەخاوەن پشك‌و بەش دەزانین، چونكە لەڕزگاركردن‌و ئازادكردنی كوردستاندا، ئێمەش بەشداربووین‌و شەهیدی زۆریشمان داوە، دەبێ لەخێرو بێریشدا بەشدار بین، كەسیش خێرمان پێ ناكات كە لەداهاتی كوردستان بەشمان دەدات، چونكە حەقی خۆمانە كەسێك كە نامانداتێ مافمان لێ زەوت دەكات‌و قەرزدارمانە هەتا ڕۆژی خۆی!

من جارێك لەگەڵ یەكێك لەبەرپرسانی لایەنە سیاسی‌یەكان دانیشتبووم گلەیی لەئێمە كردو گوتی: ئەوە بۆ دەبێ هەر ئێمە بەتەنیا دیفاع لەكوردستان بكەین‌و ئێوە هاوكاری‌تان نەكردین[٣١]؟! منیش گوتم: جێی خۆیەتی‌و شتێكی زۆر ڕەوایە كە بەتەنیا دیفاع‌و بەرگری بكەن! گوتی، بۆچی؟ گوتم چونكە ئێوە بەتەنیا داهاتی هەموو كوردستان دەخۆن دەبێ بەتەنیاش خۆتان دیفاعی لێ بكەن، من چۆن دیفاع لەشوێنێك بكەم كەلێی بێ بەشم بەدەستی خاڵی‌و گیرفانی خاڵی دیفاع دەكرێ؟! تۆ خۆت بەتەنیا لەخێرو بێری دەخۆی‌و بەشی كەسی لێ نادەی، دەجا خۆشت بەتەنیا دیفاعی لێ بكە، چونكە وەك عارەب دەڵێن: (الغُنْمُ بالغُرْمِ)!*.

---

[٣١] ئەو پارتە سیاسی‌یە لەگەڵ پارتێكی دیكەی كوردستان لەشەڕ دابوو!

* دیارە ئەوە وێڕای ئەوەش كەئێمە شەڕی نێوخۆ بەناشەرعیی‌و ناڕەوا دەزانین، مەگەر لەحاڵێكدا كەسێك دەستی لێبكرێ‌و شەڕ بەری دەرگامان پێبگرێ، هەربۆیەش هیچ كات لەوجۆرە شەڕانەدا بەشداریمان نەكردوە.

جا من ئامۆژگاری‌یەکی دڵسۆزانەم بۆ برادەرانی لایەنە سیاسی‌یەکان ئەوەیە کە با کارێك نەکەن لەکاردانەوەو بەرپەرچدانەوەو لەژێر پەردەی بیانووی ئەوە کە خەڵکێك ئیجتیهادێکی هەڵە دەکات، مسوڵمانێك ڕەفتارێکی هەڵە دەنوێنێ، قسەیەکی هەڵە دەکات، کە لەبەرانبەری ئەو هەڵەو کەمو کوڕی‌یانەدا هەڵەی زۆر زۆر گەورەتر هەیە، برادەرانی عەلمانی کەمیان بەیەکتر کرد؟! شتی وا بەیەکتر کراوەو قسابخانەی وا بۆ یەکتر دانراوەو بەزمووڕەزمی وا بەیەکتر کراوە کە کەس سەری لێ دەنارچێ، بەڵام باس نەکراوەو دیزە بەدرخۆنەی لێ کراوە!

ئێمە دەڵێین: با ئەو برادەرانە وریا بن کارێکی وا نەکەن کەئیسلامی‌یەکان خۆیان بەبێ بەش بزانن، خۆیان بەنائومێد بزانن و تووشی بێ هیوایی و دڵ ساردی بین سەبارەت بەم وەزع و واقیعە کە هەیە، ئێمە لەسەرەتاوە تێدا بووین، بەیەکەوە کوردستانمان ڕزگارو ئازاد کردوە، پێویستە بەیەکەوەش تێیدا دانیشین و لەخێرو بێری بەهرەمەند بین[35].

ئێمە وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی) وەك ئایەت و فەرموودەکانم ئاماژە پێکرد، بڕوامان بەوە نیە کە ئیسلام بەزۆر بەسەر خەڵکی‌دا فەرز بکەین، بەڵام قبووڵیش ناکەین کەهیچ کەس کوفرمان بەسەردا فەرز بکات وەك خوای مەزن فەرموویەتی: (.. لا تَظْلِمُونَ وَلا تُظْلَمُونَ)(البقرة: ٢٧٩) واتە: (نەزوڵم بکەن نەقبوڵی زوڵمیش بکەن).

ئەمجار بێگومان ئیسلامەتی شتێکە خاڵی هاوبەشمانە، چونکە هەموو خەڵکەکەمان دەڵێ مسوڵمانم، ئەوەی درۆ دەکات لەگەڵ ئیسلامداو ئەوەی ڕاست دەکات، هەمووی هەر دەڵێ مسوڵمانم، کەواتە دەبێ ڕێز لەئیسلام بگیرێ، نابێ لەکوردستانێکی ئاوادا کەمیللەتەکەی مسوڵمانە قبووڵ بکرێ جنێو بەخواو بەپێغەمبەر ﷺ و ئیسلام بگوترێ، یا جنێو بەمەلاو مزگەوت بگوترێ و سووکایەتی پێ بکرێ، ڕێگای دینداریی و قورئان خوێندن و مزگەوت و ڕیش

---

[35] بێگومان سەرجەم هاووڵاتی‌یانی کوردستان بەتێکڕای ڕەگەزو دین و مەزهەبەکانیانەوە لەخێرو بێری وڵات دا بەشدارن ئەگەر خەباتیشیان نەکردبێ بەڵام من وەك خستنەڕووی واقیع و حاڵی خۆمان ئەوە باس دەکەم.

هێشتنەوە بگیرێ، یان ڕێگای سەرپۆش خستنە سەر سەری ئافرەتان بگیرێ، ئەوە ڕێگای دینداریی گرتنەو نابێ قبووڵ بکرێ.

بەڕاستیی وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانە: ئێمە دەبێ پەند لەشوێنانی دیکەی وەك جەزائیرو کوێ‌و کوێ وەربگرین، کە لە ئەنجامی زەخت و زۆرو فشاردا خەڵك بیر لەشتی دیکە دەکاتەوە، من داوای دڵسۆزانەم ئەوەیە کەئێمە ناچار نەکرێن‌و خەڵکمان ناچار نەبێ بیر لەشتی دیکە بکاتەوە، با بەتەبایی‌و لەباری‌و بەدۆستانە پێکەوە بژین، ئێمە نایشارینەوە کەدەستەڵاتمان هەبێ‌و خەڵکمان بۆ ئیقناع بکرێ، کوردستان دەکەین بەکوردستانێکی ئیسلامیی‌و شەریعەتی خوای لەسەر حاکم دەکەین، نایشارینەوەو نەمان شاردۆتەوە، میللەتێکی مسوڵمانیش دەبێ جگە لەسیادەتی شەریعەتی خواو حاکمیەتی شەریعەتی خوا بەحاکمیەت‌و سیادەتی هیچ بەرنامەیەکی دیکە ڕازی نەبێ، چونکە هەر کەسێك بەکوفر ڕازی بێت پێی کافر دەبێت، وەك (ابن حجر الهیتمی)[٣٦] دەڵێ: (وأجمعت العلماء على ان الرضا بالكفر كفر)[٣٧] واتە: سەرجەم زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەك دەنگن کەهەر کەسێك بەکوفر ڕازی بێت پێی کافر دەبێت.

ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان سیستەمێکی غەیرە ئیسلامی بەسەر کۆمەڵێکی ئیسلامی بەسەر میللەتێکی مسوڵماندا فەرزدەکرێ‌و دەبێتە حاکم لەهەل‌ومەرجێکی نائاساییدا بەهەرحاڵ ئەوە واقیعێکە تەعامول‌و مودارای لەگەڵدا دەکرێ‌و دەبێ وردە وردە لێزانانە بگۆڕدرێ، بەڵام ڕازی بوون پێی کوفرە.

---

[٣٦] کە یەکێکە لەزانا پایە بەرزەکانی ئیسلام‌و خاوەنی کتێبی ناوداری (تحفة)یە.

[٣٧] بڕوانە: (الزواجر عن اقتراف الكبائر) کە گوتوویەتی: (فمن انواع الكفر والشرك.. او يَرْضى بالكفر ولَوْ ضمناً..) ج١ص٤٨ تا ٥٠، بەڵام دەقی ئەو قسەیەی کە من لێرەوە نەقڵم کردووە لەکتێبی (الاعلام بقواطع الاسلام)دا کە هەر هی ئەوە هاتووە، لەکتێبی (الزواجر عن اقتراف الكبائر)دا ئەو دەقەم نەدۆزیەوە، هەرچەندە ئەو مەسەلەیە چەندان دەقی قورئان‌و سوننەت دەیگەیەنن‌و حەوجێ بەقسەو فەتوای زانایان ناکات بۆ ئیسپاتی ئەوە (کە ڕازی بوون بەکوفر کوفرە).

# قسەیەکی کورت لەگەڵ مامۆستایان دا

لێرەشدا من ڕوودەکەمە مەلایەکانی کوردەواری (مامۆستایان) کە تێکەڵێیان لەگەڵ لایەنە سیاسی یەکاندا هەیە بەتایبەت لەگەڵ بەرپرسەکانیاندا، دەڵێم: مامۆستایانی بەڕێز! دینی خۆتان بەدونیای خەڵك مەدەن، ئێوە سەیر بکەن کە (ئیمام شافیعی)تان چۆن بووە کە دەفەرموێ: سوێند بەخوا ئەگەر بزانم خواردنەوەی ئاوی سارد جوامێریم دەڕووشێنێ تەنیا هەر ئاوی گەرم دەخۆمەوە، ئاوی ساردیش منەتی تێدابێ و جوامێری و پیاوەتیم بڕووشێنێ هەرگیز نایخۆمەوە.

ئیمام شافیعی کەبەسەر مەزهەبی گەلی کوردی دەزانین ئاوا بووە، هەروەها پیاوی وەکو شێخ عەبدولقادری گەیلانی، سەیید ئەحمەدی سەرهەندی ناسراو بەئیمام ڕەببانی، با مامۆستایانمان، شێخەکانمان، دەروێش و سۆفی یەکان، خەڵك، تەماشا بکات کە ئەو کەڵە پیاوانە چۆن بووون، بەتایبەتی لەگەڵ دەستەڵاتداراندا چۆن بووون، عەبدولقادری گەیلانی چۆتە سەر مینبەر وتاری داوەو خەلیفەی موسوڵمانانیش لەوێ بووە، زۆر لە خەلیفە تووڕە بووە لەسەر ئەوەی کە ناشەرعی یەکی کردوە، دوایی یەکێك لەموریدەکانی پێی گوتوە: مامۆستا ئەرێ نەترسای لەخەلیفە؟! ئەویش گوتی: ڕۆڵە گیان! کەچوومە سەر مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ خەلیفە هەر بەقەدەر پشیلەیەك دیار بوو لەبەرچاوم!!.

دەبا ئەهلی تەریقەتمان ئاوا شوێن عەبدولقادری گەیلانی بکەون، زاناو پیاوچاکانی ڕابردوومان هەرگیز ئامادە نەبوون ناهەقی و ناشەرعی قبووڵ بکەن، یان لەئاست ناحەقدا بێدەنگ بن، وە لەو پێناوەدا باجی زۆریشیان

داوە لەگرتن و ڕاوەدوونان و دەربەدەرکردن. دەبا ئێمەش ئەگەر ڕاست دەکەین شوێنکەوتووی ئەوانین دینی خۆمان بەدونیای خەڵك نەدەین.

وە بەڕاستیش دڵسۆزیی بۆ بەرپرسانی ئەمڕۆی ئەم دوو ئیدارە کوردییە لەلایەنی مامۆستا - مەلا - یەکانەوە ئەوەیە کەهەقیان پێ بڵێن و لەهەڵەکان ڕاستیان بکەنەوە، نەك خوانەکردە تەئویل و پینەو پەڕۆی هەڵەو پەڵەو ناشەرعیی یەکانیان بکەن و، فەتوای نابەجێیان بۆ بدەن و ملی دەقەکانی شەرع بەرەو لای ئارەزوو و بەرژەوەندییە ناڕەوایەکانیان با بدەن!

خوا عاقیبەتی هەموو لایەکمان خێر بکات و لەعەیبداریی و شەرمەزاریی لای خوا و خەڵکی پەنامان بدات و بمانپارێزێ.

ئامـــــــــــــین.

# نێوەڕۆك

**خوێنەری بەڕێز/**

بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی خوێنەرو ئاگاداربوون، پێشتر سێ نامیلکەی تر بڵاوکراوەتەوە بەم ناونیشانانە:

١- پێشمەرگەی ئیسلام یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟

٢- جیهاد لەڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگاداری‌یەك.

٣- جیهاد لەڕێی خوادا: بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێ نەگەین و لەسەر جەنگ کردنمان قەرزار نەبینەوە.

ئەم کتێبەی بەردەستیشت، بەو هیوایەی ئەم زنجیرەیە لەداهاتوودا لەبەرگێکدا بەدیدەی خوێنەری کورد زمانی مسوڵمان شادبێت.

هەروەها (شەهید کێیەو پلەو پایەی لە ئیسلامدا) لە داهاتوویەکی نزیکدا خوا پشتیوان بێ بەچاپ دەگەیەنرێ و بڵاودەکرێتەوە.

ژمارە سپاردنی (١٦٩)ی ساڵی ٢٠٠٢ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە